جۆناسان وێڵسن

# هەرەمی هەڵگەڕاوە



## مێژووی تەکتیکی تۆپی پێ



وەرگێڕانی: کامەران پاڵانی



2019

# هەرەمی هەڵگەڕاوە

## مێژووی تەکتیکی تۆپی پێ

جۆناسان ویڵسن

وەرگێڕانی: کامەران پالانی

چاپی یەکەم

٢٠١٩

ناوی کتێب : هەرەمی هەڵگەڕاوە
نووسینی: جۆناسان وێڵسن
لە عەرەبییەوە: کامەران پاڵانی
دیزاینی بەرگ: لاوان ئەحمەد
دیزاینی ناوەوە: کامەران پاڵانی
تایپ: کامەران پاڵانی
نۆرە وساڵی چاپ: یەکەم ٢٠١٩
لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارە سپاردنی (      ) ساڵی ٢٠١٩ی پێدراوە

# پێڕست

هەرەمی هەڵگەڕاوە

هەرەمی هەڵگەڕاوە

## سەرچاوەی وەرگێڕانی ئەم کتێبە:

الهرم المقلوب – دليلك لفهم أسرار الساحرة المستديرة – جوناثان ويلسون، ترجمة: أحمد مختار،

من إصدارات موقع العربية الجديد / قسم الرياضة، ٢٠١٦.

## پێشکەشە بە:

- خێزانـــی خۆشەویـــستم (مامۆســـتا شـــەهلا) و کـــچە بچکۆلانەکەم (شایستە).
- هەموو ئەوانەی ڕۆڵیان بینی لە پێشخستنی تۆپی پێ بە شێوەیەکی گشتی و لایەنە تەکتیکییەکەی بە تایبەتی.

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی

### ناساندنی کتێبی (هەرەمی هەڵگەڕاوە)

کتێبی هەرەمی هەڵگەڕاوە بە یەکێك لە گرنگترین ئەو کتێبانە دادەنرێت کە باسی مێژووی تەکتیکی تۆپی پێ دەکات. ئەم کتێبە بە زانیاریەوە باسی پلان و شێوازی یاریکردن دەکات لە سەرەتای دەرکەوتنیەوە تا ئەم سەردەمە، لە پلانە سەرەتاییەکانەوە بۆ دواین پێشکەوتنەکانی ئەم چەند ساڵە. نووسەری ئەم کتێبە (جۆناسان وێڵسن) بە شێوەیەکی جوان باس لە پێشکەوتنەکانی لایەنی تەکتیکی تۆپی پێ دەکات.

نووسەر لەم کتێبەدا باسی گۆڕانکارییە جەوهەریەکانی یاسا و ڕێساکانی تۆپی پێ دەکات، لە سەرووی هەموویانەوە یاسای ئۆفساید و گۆڕانکارییەکانی، دیارترین ستراتیژیەتەکانی تۆپی پێ، لەگەڵ باسکردنی شێوازەکانی یاریکردنی (کاتیناچۆ، سەراپاگیری – كرة الشاملة – ، پراگماتیکی ئینگلیزی) و بەدڵنیاییەوە گەشەکردنە تۆقێنەرەکەی ئەی سی میلانی (ئەریگۆ ساکی) بە سەرکردایەتی سیانەی ترسێنەری هۆڵەندی (رایکارد، گولیت، ڤان باستن) لە

یاریگەکانی ئیتاڵیا و ئەورووپادا.

ئەم کتێبە جیادەکرێتەوە بە لەخۆگرتنی ژمارەیەکی زۆر زانیاری بەپێز، لەگەڵ ڕێژەیەکی زۆر لە وێنە و هێڵی پلاندانان، هاوکات لەگەڵ کورتکراوەیەکی تەواو و گشتگیری ئەو وەرچەرخانە هونەریانەی کە ڕاهێنەرە گەورەکان بە درێژایی مێژووی ئەم یاریە پێی هەستاون، هەربۆیە "هەرەمی هەڵگەڕاوە" جێگای تایبەتی و جیاوازی لە دڵی هەموو ئاشقانی تۆپی پێدا هەیە.

ئەم کتێبە یەکێك لەو کتێبانەبوو کە بۆ خەڵاتیساڵانەی "ویلیەم هیلێ بۆ کتێبی ساڵ" هەڵبژێردرا و توانی خەڵاتی بەریتانیا بۆ کتێبە وەرزشییەکان، بباتەوە.

## هەڵبژاردنی ناوی کتێبەکە

درەوشانەوەی ئەستێرەکانی وەك پلاتینی و مارەدۆنا، ڕاهێنەرانی ناچارکرد دەستکاری پلانەکانیان بکەن، لە ڕووی لۆژیکی "ئەنجام پاساوی هۆکار دەداتەوە"، هەربۆیە کارلۆس بیلاردۆی ڕاهێنەر بیرۆکەیەکی بۆ هات، بە یاری کردن بە سێ یاریزان لە بەرگری، پێنج یاریزان لە ناوەڕاست، دوو یاریزانیش لە هێرشبردن. ڕۆژنامەکان لەو کاتەدا هێرشیان کردە سەری، بەڵام ئەو گوتی: "من لە سەر هەقم و ئەستەمە بە یەك هێرشبەر بەرامبەر ئەورووپیەکان یاری بکەین، بۆیە بە بوونی یاریزانێکی زیاتر لە ناوەڕاست ئازادی

تەواو دەدرێت بە دییەگۆ ئارماندۆ مارەدۆنا لە هێرشبردندا". پلانی (٤ – ٣ – ١ – ٢) گۆڕدرا بۆ پلانی (٣ –٥ – ٢) یان (٣ – ٥ – ١ – ١).

سەرەتاکانی تەکتیکی تۆپی پێ لەگەڵ تەکتیکی هەرەمی بەناوبانگ (٢ – ٣ – ٥) بوو، مارەدۆنا و هاوڕێکانی توانیان هەرەمەکە ئاوەژوو بکەن بۆ (٥–٣–٢) بە گەڕانەوەی هەردوو یاریزانەکەی تاکی بەرگری بۆ دواوە لە کاتی بەرگریکردندا، بە ژمارەیەکی زۆر یاریزان ڕێگای گەیشتنیان بۆ گۆڵەکەیان دادەخست، لەگەڵ بوونی سێ یاریزان لە یەك کاتدا لە دواوەی دییەگۆ، ئا بەم شێوەیە ئەم تەکتیکە بوو بە ناودارترین تەکتیك لە مۆندیالی (١٩٨٦)دا.

(جۆناسان وێڵسن)ی نووسەریش ئەم گۆڕانکاریە تەکتیکیەی بە لاوە گرنگ بوو، بۆیە کتێبەکەی ناونا (هەڵگەڕانەوەی هەرەم) کە لە دنیای ڕاگەیاندندا بە (هەرەمی هەڵگەڕاوە) ناسێنرا.

**ناساندنی نووسەری کتێبەکە**

جۆناسۆن وێڵسن نووسەرێکی بەریتانی تایبەت بە هەردوو یاری تۆپی پێ و کرێکێت. لە کتێبەکانیدا تیشك دەخاتە سەر تیپ و پاڵەوانێتییەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا و هەردوو کیشوەری ئەفریقیا و ئەمەریکای لاتین، بە دڵنیاییەوە لایەنی تەکتیکی بەشێوەیەکی گشتی لە زۆربەی بابەت و بەرهەمەکانیدا بوونی هەیە، جا لە کۆپی کاغەزین

یان کۆپی ئەلیکترۆنی بێت.

وێڵسن خاوەنی گۆڤارێکی تایبەتی دیاریکراوە بە ناوی ( The Blizzard)، گۆڤارێکی وەرزیە و تایبەتە بە وەرزشی تۆپی، کە زۆربەی بابەتەکانی ئاڵۆز و نوێن، ئەم گۆڤارە لە ئینتەرنێت بۆ خوێندنەوە بەردەستە لە بەرامبەر بە بڕێك پارەی کەمدا، هەروەها بابەتی بەردەوامی هەیە لە زۆربەی ڕۆژنامە ئینگلیزیەکاندا، لە سەروویانەوە ڕۆژنامەی گاردیان و چەند ڕۆژنامەیەکی ئەورووپا، زۆرکەس وێڵسن بە ڕۆژنامەنووسی ژمارە یەکی بواری تەکتیك ئەژمار دەکەن.

ئەم نووسەرە بە نووسینی کتێبێکی تایبەت بە ڕاهێنەری ناوداری ئینگلیزی (برایان کلۆف) ناوبانگی دەرکرد، بەتایبەتی لە دانانی ناونیشانی گۆڤارەکە بە ناوی "کەس هەرگیز ناڵێت سوپاس"، ئەمە ئەو زوڵمە گەورەیە دەردەخات کە لە دروستکەری دەستکەوتەکانی نۆتینگهام فۆرست کراوە لە لایەن مێدیاکانی بەریتانیاوە. پاشان "هەرەمی هەڵگەڕاوە"ی نووسی و تیایدا دووپاتی لە لێهاتوویی و جیاوازی خۆی لە نووسەرەکانی تر کردەوە، لەبەرئەوەی باسی لایەنێك دەکات جیاوازتر لەوەی باوە لە ناوەندەکانی ڕاگەیاندندا.

کامەران پالانی

٢٠١٨/٣/٥

## بەشێك لە پێشەكی نووسەر

## مێژووی تەكتكیك

لە سەرەتادا، هیچ شێوازێك لە سەرووی شێوازی هێرش بردن نەبوو، نە ئاڵۆزی لە پلان و نەفەلسەفەی زیادە، تەنیا یاریەك لە سروشتی خۆی، كە بە دەوری تۆماركردنی زۆرترین گۆڵ بەپێی توانا لە پێناو بردنەوەدا دەسوڕایەوە، هەربۆیە هەموو تیپەكان هەوڵیان دەدا بەرەو پێشەوە یاری بكەن، بە دانانی زۆرترین ژمارەی یاریزان لە سێیەكی كۆتاییدا كە پێنج یاریزانە، لەگەڵ تەنها سیانەی ناوەند و دووانەی بەرگری لە بەردەم گۆڵدا، وەك هێڵێكی نزیك لە (٢-٣-٥)دا، ئەگەر ئەم وێنە هێڵەكیە بكێشین زۆر لە هەرەمێكی هەڵگەڕاوە دەچێت، ژمارەیەكی كەم لە خوارەوە پاشان ژمارەیەكی زۆر لە سەرەوە.

هەرەمی هەڵگەڕاوە




یەکەمین پلانی بەکارهاتوو لە مێژووی تەکتیکی تۆپی پێدا، کە بە پلانی هەرەم ناسراوە

بەم پێشەکیە، نووسەر گەشتە هونەریەکەی دەست پێ دەکات، کە تێیدا هەڵدەستێت بە دیراسەکردنی هەموو سەردەمەکان لەگەڵ دەستنیشان کردنی دیارترین شێوە تەکتیکیەکانی، لەگەڵ گرنگترین پێشەوا و ڕاهێنەرەکانی، تاکو دەگاتە تۆپی پێی تازە، تێیدا ئاڵۆزی و هەوڵدان بۆ بردنەوە بە کەمترین زیان، هەرەمەکە جارێکی هەڵدەگەڕێتەوە، یان پێچەوانە دەبێتەوە بۆ شێوە ڕاستیەکەی خۆی، کە قورسایی لە دواوە و سوکی لە پێشەوە،

لێرەوە دەست دەکەین بە شیکردنەوەی لایەنە شاراوەکانی هـەرەمی هەلگەڕاوە.

**یەکەم: لە دریبەکان (المراوغات)ەوە بۆ (١-٢-٧) .. سەرەتاکانی دروستبوونی هەرەمی تەکتیکی**

لە سەرەتادا، هەڕەمەکی و پاشاگەردانی شـێوازێکی بـاو بـوو، تۆپی پیێ لـە یەکـەمین هـەنگاوەکانی کرداریـیـدا، بـێ پـلان و تـەکتیك بوو، تەنیا یارییەکی هەڕەمەکی و هێرشی بـەردەوام لـە لایەکـەوە بـۆ سەر لایەکی تر بوو. یاریەکە بەرەبەرە بلاّودەبوویەوە لە ڕۆما، میسر، یۆنـان، مەکسیك، ئەمـەریکای لاتـین و ولاّتـانی تـری ئاسـیا، هـەموو شوێنێك یاسای تایبەتی خۆی هەبوو، بەلاّم لە کۆتاییدا تیپێك لە دژی تیپێـك و هێـرش بـردن دەسـتی بەسـەر کـەش و هـەوای یاریەکـەدا دەگرت.

## پەیدابوونی پلان

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا پلانەکان بەدەرکەوتن، بەلام هەردەم برین و جموجۆلەکانی تاکە کەسی و هەولدان بۆ تۆمارکردنی زۆرترین گول، لە یاریەکاندا بالادەست بوو، هەربۆیە ئەستەم بوو بینەری یاریزانێك بیت پاس بدات بە هاورێکەی، بەلکو باوی ئەوەبوو هەر یاریزانێك تۆپەکە وەربگرێت و خۆی بۆ خۆی بڕوات بۆ ناو گولی تیپی بەراملەر، جا بە دریبکردن بێت یان لێدانی شووت لە دوورەوە، لەبەرئەوەی تۆمارکردنی گول تاکە ئامانج بوو بە لای یاریزانەوە و ناوبانگێکی زۆری بۆ پەیدادەکرد.

پێدەچێت بالادەستی دریبەکان بەهۆی یاساکانی ئەو کاتەی (تۆپی پێ)وە بووبێت، بەپێی یاسای ئۆفساید هەر یاریزانێك خۆی بە تەنیا لە نزیکی گولی تیپی دژبەر بێت ئەوا دەکەوێتە ئۆفسایدەوە با ئەو یاریزانەش لە بنەڕەتدا بەشداری هێرشەکەی نەکردبێت. مێژووی ئۆفساید دەگەڕێتەوە بۆ یاساکانی تۆپی پێ، کە لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا لە قوتابخانە گشتیەکانی ئینگلتەرادا دانرا.

یاسای ئۆفساید لەو کاتەدا زۆر لە یاسای ئۆفسایدی ئێستای یاری ڕەگبی دەچوو، بەهۆی ئەم یاساوە ئینگلیزەکان زۆر رقیان لە پاسدان بوو، بۆیە لە سالەکانی سەرەتایدا ئەم یاریە تەنها لە دریب کردن و لێدانی شووت خۆی دەبینیەوە.

## یەکەمین پلان

بڕوا دەکەیت یاخود نا، ئەم تەکتیکانە یەکەمین ناوکی تۆپی پێ بوون، یەکەم یاری دۆستانەی نێودەوڵەتی لە نێوان (ئینگلتەرا و سکۆتلەندا)دا بەڕێوەچوو، ئینگلیزیەکان بە پلانی (١-٢-٧) یاریان دەکرد و سکۆتلەندیەکانیش بە پلانی (٢-٢-٦)، بەجۆرێك هەر تیپێك زۆرترین یاریزانی لە هێڵی پێشەوە دادەنا، لەگەڵ هێشتنەوەی یاریزانێك یان دووان لە بەردەم هێڵی گۆڵدا، هەربۆیە ئینگلیزەکان پەنایان بردە بەر دریبکردنی بەردەوام، کەچی گەلی سکۆتلەند بیرۆکەی پاسدانیان هێنایە ناو تۆپی پێ، یاریەکە لە نێوان دوو شێوازدا (دریبکردن و پاسدان) نزیك بوویەوە.

هەرەمی هەڵگەڕاوە




پێکهاتەی یەکەم یاری نێودەوڵەتی: سکۆتلەندا ۰ — ۰ ئینگلتەرا، ۳۰ / ۱۱ / ۱۸۷۲

لە سکۆتلەندا بە دیاری کراوی لە شاری ڕەینجەرزدا، یانەیەك بەناوی کوینز پارك هەبوو، زۆربەی یاریزانەکانی پشتیان بە هێرشبردن و دریبکردن دەبەست، ئەمانیش هاوشێوەی نزیکەکانیان پەنایان دەبردە بەر هێشتنەوەی زیاتری تۆپ، تەنها یاریزانێك نەبێت کە کەمێك قەڵەو بوو، نەیدەتوانی وەك هاوڕێکانی بجولێت.

ئەم یاریزانە پارێزگاری لە تۆپەکە دەکات پاشان لەسەری

دەوەستێت و دەیدات بە یاریزانێکی تر، ڕێ دەکات بۆئەوەی شوێنێکی گونجاوتری دەستبکەوێت، بەم شێوەیە. کۆمەڵێك دریب و ڕادەکات، ئەمیش پاس دەدات و دەجوڵێت. بەرەبەرە بیرۆکە سەرەتایەکە جێی دەبوویەوە لە لای هەمووان بەتایبەتی ڕاهێنەر و دەستەی یاریدەدەری، پاشان لە نێو تیپەکانی سکۆتلەندا بڵاوبوویەوە و بەخێرایی گەیشتە یاریگەکانی ئینگلتەرادا، ئەم هەنگاوە بە سەرەتایەك دادەنرێت بۆ پێشخستنی تێگەیشتن لە تۆپی پێدا.

## سەرەتای هەرەم

ژمارەیەکی زۆری یاریزان لە هێرشبردندا، کاتێك بە چاوەکانت تەماشای پێشەوە دەکەیت پێنج بۆ شەش هێرشبەر بەدی دەکەیت، بەم هۆیەوە بیرۆکەی برینی بەردەوام زۆر نەرێنی دەرچوو، هەربۆیە چارەسەر پەنابردنە بەر پاسدانی قاچ بۆ قاچ بوو، لەپێناو دروستکردنی بۆشاییەکی پێویست بە جوڵاندنی تیپی دژبەر بەرەو ڕووی تۆپەکە.

ستراتیژیەتی پاسدان، ڕابەرایەتی پێشخستنی لە یاساکانی تۆپی پێدا کرد، ئینجا وردەوردە ئینگلیزەکانیش هەوڵی سوود وەرگتنی تەواویان لەم تایبەتمەندییە دەدا، بە ناچارکردنی یاریزانێك یان دووان بە جێهێشتنی پێشەوە و گەڕانەوە بۆ ناوچەی ناوەڕاست،

تا پاسدەرەکە بتوانێت بژاردەی زۆری دەست کەوێت لە هەموو ناوچەیەکی یاریگەدا. هەربۆیە ڕاهێنەر و پسپۆڕی هەنگاری (ئەرباد کاسندای) پێی وابوو یەکەم تەکتیکی ڕاستی تۆپی پێ لە کامبریج لە ساڵی ١٨٨٣ دەستی پێ کرد، بە گەڕانەوەی یاریزانێك لە هێرشبردن بۆ ناوەڕاست و ئامادەبوونی سیانەی تەواو لە ناوەندی یاریگەدا.

بەڵام (وێڵسن) ئاماژە بەوە دەکات ئەم تەکتیکە لە لایەن یانەی (نۆتینگهام فۆرست)ەوە لە حەفتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا بەکار هاتووە، هەروەها لە لایەن تیپی (ڕێکسهام) بەشێوەیەکی تەواو لە یاریەکی کۆن لە ساڵی ١٨٧٨ بەکارهاتووە، بەدەر لەوەی کێ یەکەمجار ئەم تەکتیکەی بەکارهێنا، ئەم تەکتیکە بوو بە تەکتیکێکی خۆشەویست و نموونەیی لە لایەن هەموو تیپەکانی ئینگلتەرا و سکۆتلەندا، تا گۆڕینی یاساکانی ئۆفسايد لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا.

پلانی هەرەم پشتی بە بوونی دووانەی دڵی بەرگری، سیانەی ناوەند، پێنج هێرشبەری تەواو دەبەست، بە بوونی یاریزانێکی ناسراو کە بە (سەرکردەی ئۆکسترا) ناوبانگی دەرکردبوو، بەرگریکردن و هێرشبردنی پێکەوە دەبەستەوە، بوو بە ئەڵقەی گەیەنەری نادیار لە سەرەتای دروست بوونی تۆپی پێوە تاکو دەگاتە تەکتیکی هەرەم، ئەم یاریزانە هەڵدەستا بە بڕینی تۆپەکان لەگەڵ زیادکردنی توانای هێرشبردن بە هاتنی لە دواوە بۆ پێشەوە، هەربۆیە ئەم شوێنە وەکو

سوپرایزێکی گەورە بۆ ئاشقانی تۆپی پێ بوو لەو سەردەمەدا، بە (Center-half) دەناسرا یانی نیوەی بەرگریکار و نیوەی ناوەند، لە هەندێك یاریدا دەبوو بە هێرشبەرێکی تەواو لەگەڵ پلانی (٢-٣-٥) ناسراو بە (The Pyramid) هەرەمەکە.




پلانی هەرەم (The Pyramid)

لەگەڵ دروستبوونی تەکتیکی هەرەمدا، هەمووان گومانیان

دەكرد ئەم وێنەیە دەبێت بە بەهێزترین ئەو داهێنانەی یاساكانی تۆپی پێ بەرهەمیان هێناوە، بەڵام كەس نەیزانی ئەم پلانە تەنها سەرەتایەك دەبێت و ئەوەی لە داهاتوودا دێت زۆر جیاواز دەبێت، بەتایبەتی لەگەڵ ڕاكێشانی بەڕەكە لە ژێر پێی ئینگلیزەكاندا بەڕووی ئەو وڵاتانەی بە هەزاران كیلۆمەتر لێی دوون لە ئەمەریكای لاتیندا، لەگەڵ هەڵبژاردەكانی دراوسێی كە بیرۆكەكەیان وەرگرت و لە دوایدا بەسەر خاوەنەكەیدا سەركەوتن.

## دووەم: لە ئینگلتەراوە بۆ ئەمەریکای لاتین ... گەشەکردنی

### هەرەمی تەکتیکی

ئینگلتەرا لانکەی تۆپی پێ یە، ئەم یاریە لە هەناوی دوورگەی بەریتانی لەدایك بوو، لەوێدا ئینگلیزەکان دەستیان کرد بە پیشاندانی کاڵە نوێکانیان بە دەوڵەت و ناوچە جیاوازەکان، تاکو جادوگەرە خڕەکە (تۆپ) گەیشتە زۆربەی شوێنە ئاوەدانیەکان، لە ڕێگەی کۆچبەرەکان بۆ وڵاتانی ئەمەریکای لاتین و باباکانی پیشەسازی و بازرگانی کە لە هەردوو کیشوەری ئاسیا و ئەفەریقیادا بە دوای قازانجی زیادە دەگەڕان، لەم سۆنگەیەوە پارچە پێستە فووتێکراوەکە لە نێو منداڵ و خەڵکە سادەکان بڵاوبوویەوە.

#### تێکشکاندنی داخراوی

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا ئەم یاریە بەشێوەیەکی زۆر بەهێز هاتە ناو ئەمەریکای لاتین، لەگەڵ زاڵبوونێکی تایبەتی تۆپی ڕەگبی، تاکو سەرەتای تێکشکاندنی داخراوی لە لایەن کۆچبەرە ئینگیلیزیەکانەوە بۆ ئەو وڵاتە دوورانە، بەتایبەتی هەردوو وڵاتی ئەرژەنتین و ئۆرۆگوای، ئەمەش بەهۆی چاکەی ئەلێکساندەر واتسۆن هۆتۆن (١٨٥٣ – ١٩٣٦) کە دەرچووی زانکۆی ئەدنبەرەیە کە بۆ وانەوتنەوە لە قوتابخانەی (سانت ئاندرۆ) هاتبوو بۆ ئەرژەنتین، دواتریش دەستی لەکار کێشایەوە لەوکاتەی قوتابخانەکە

ڕەتی کردەوە یاریگەکانی تایبەت بە تۆپی پێ فراوان بکات.

هەربۆیە قوتابخانەیەکی تایبەت بە فێرکردنی تۆپی پێ دانا، بەمەش یاریەکە لە کۆڵان و گەڕەکە جیاوازەکانی (بۆینس ئایرس) پەرەی سەند. چیرۆکێکی هاوشێوەی ئەمە لە ئۆرۆگوای ڕوویدا، یانەیەکی تایبەت بە کریکێت و سەوڵ لێدان لە لایەن ولیام لیزلی پوول (١٨٦٦ – ١٩٣١) دامەزرا، کە ئەو مامۆستا بوو لە دواناوەندی (مۆنتی ڤیدیۆ)، ئەم مامۆستایە سەرکەوتووبوو لە هێنانە ناوەوەی تۆپی پێ لە ڕێگەی چالاکیەکانی یانەکەیدا، یاریەکە جێگای تایبەتی خۆی کردەوە لەم دوو وڵاتەدا.

لە ئەنجامی ئەم هۆکارانەوە، تۆپی پێ لە ئەرژەنتین و ئۆرۆگوای بە خێرایی گەشەی سەند، بە شێوەیەکی خێرا تێگەیشتن لە زۆربەی لایەنەکانی تەکتیك، بە بەراورد بە وڵاتانی دراوسێیان، دواتر لە یەکەم جامی جیهانیدا، یاری کۆتایی لە نێوان ئەم دوو وڵاتەدا بوو، کە ئۆرۆگوای بە ئەنجامی (٤ – ٢) بوو بە پاڵەوانی مۆندیال، لەگەڵ بەدەست هێنانی میدالیای ئاڵتوونی لە هەردوو ئۆڵۆمپیادی (١٩٢٤، ١٩٢٨)دا.

### هەرەمی هەڵگەڕاوە




پێکهاتەی فینالّی مۆندیالی ۱۹۳۰: ئۆرۆگوای ٤ — ۲ ئەرژەنتین

## فەلسەفەی تۆپی پێ

هەروەك چۆن لە هەموو کاتێکدا ڕوودەدات، گروپێك لە لای ڕاست و گروپەکەی تر لە لای چەپدا دەبێت، تۆپی پێ بەردەوام خۆی دەبینێتەوە لە گوفتوگۆ و مشت و مڕی نێوان لایەنگرانی تۆپی پێی هێرشبردن کە پشت دەبەستێت بە دەست پێشخەری و کار، لایەنگرانی تۆپی پێی بەرگری کە زیاتر پشت دەبەستێت بە لایەنی

بــەرگری و وەڵامدانــەوەی کــار بــە یــاریکردن لەســەر هێرشــی هەڵگەڕاوەدا.

لەگەڵ داننان و ڕازیبوون بەوەی ئینگلتەرا یارمـەتی بڵاوبـوونی تۆپی پێـی دا، بـەڵام تـۆپی پـێ لـە ئەمـەریکای باشـور تێڕوانینێکـی جیـاواز و تـامێکی تایبــەتی وەرگــرت، لەبەرئــەوەی هــەر وڵاتێــك و کەسایەتی تایبەتی خۆی لە لاکانی مۆر کرد، بەشێوەیەك هەر تیپێکی ئەمـەریکای لاتـینی بـوو بـە خـاوەن تایبەتمەنـدی جیـاوازی خـۆی، ئۆرۆگوای بە بـەهێز و بەجورئـەت و ورەبـەرزیی ناسـرا، بـەم هۆیـەوە ناویان نا بە (گارا)، یـانی ئازایـەتی و ڕۆحیـەتی بـەرزی شـەڕانگێزی، تیپێك لە توانایدا هەیـە زاڵ ببێـت بەسـەر بـەهێزترین رکابـەرەکانی، هەربۆیە ئەم گەلە خاوەن سێ ملیۆن دانیـشتووانە، بـوو بـە پاڵـەوانی دوو جامی جیهانی لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا.

لـە لایـەکی تـرەوە تـۆپی پێـی ئـەرژەنتینی لـە ڕێگـەی تیپـە هەنگاریەکانەوە بوو بە خاوەنی تایبەتمەندی جیاوازی خۆی، کە تیپە هەنگاریەکان بە بەردەوامی سەردانی ئەرژەنتینیان دەکرد، لـە پێنـاو ئەنجامدانی چەندین یاری دۆستانە لە نێوان ئـەم دوو هەڵبژاردەیـەدا. کەسایەتی تۆپی پێی دانـوبی گواسـترایەوە بـۆ وڵاتـی تـانگۆ، یەکـەم لادان لە تەکتیکی هەرەم لە (٢ – ٣ – ٥)ەوە بـۆ (٢ – ٣ – ٢ – ٣) دەسـتی پێکـرد، بـە گەڕانـەوەی دووان لـە پێـنج هێرشـبـەرەکە بـۆ ناوەڕاست و زیادکردنی تایبەتمەندی پاسدان لەگەڵ دریب کردندا.

## ئینگلتەرا هەموو ئەورووپا نی یە

جارێکی تر لە ئەمەریکای باشورەوە بۆ ئەورووپا، کە وڵاتانی تری وەك نەمسا و هەنگاریا توانیان ئەنجامی زۆر باش بەدەست بهێنن لە پەرەپێدانی تۆپی پێ و زیادکردنی جەماوەرەکەی بە شێوەیەکی بێ شومار، ئەم وڵاتانە لە لەمسەی جوانی سەرکەوتووتربوون بە بەراورد بە ئینگلیزەکان، لەبەرئەوەی تۆپی پێ لای ئەوان مانای "هونەری چێژبەخش" دەگەیەنێت، واتە پاسدانی زیرەکانە و شوتی جوان لەگەڵ دریبی جیاوازدا، چاکەی هەموو ئەمانە دەگەڕێتەوە بۆ پیاوێکی ئینگلیزی بەناوی جیمی هۆگان (١٨٨٢ – ١٩٧٤)، کە گەشتی دەکرد بۆ وڵاتانی تر و بیرۆکەکانی تێیاندا بە جوانترین شێوە جێبەجێیانی دەکرد.

لە کاتی گەشتێکی هاوینەی یانەی بۆڵتۆن لە هۆڵەندا، هۆگان کاتێکی خۆشی بەسەربرد لە نێو وڵاتێکی بچووکی ئەورووپی، لە دوای ڕاهێنانەکان دەچووە نێو کۆلانەکان و لەگەڵ خەڵکدا گفتوگۆی دەکرد، دەڕۆیشت بۆ شوێنی ڕاهێنانەکان و تەماشای تیپەکانی دەکرد یاریان دەکرد، لەگەڵ یاریزانە هۆڵەندیەکاندا دەکەوتە ئاخافتن، ڕاستیەکی لە لادا دروست بوو "هۆڵەندا وڵاتێکە دەیەوێت تۆپی پێ لە یانەکانیدا جوان بکات".

هۆگان گەڕایەوە بۆ ئینگلتەرا و بە یەکجاری ماڵئاوایی لە تۆپی

پێ کرد، لە لانکەی (تۆپی پێ)وە جارێکی تر بڕیاری گەشتکردنی دا بۆ هۆڵەندا، ئەم جارەیان بۆ ئەوەی لە هەمان کاتدا ڕاهێنەر و یاریزانی تیپی (دۆردریچ) بێت، لە هۆڵەنداوە بۆ نەمسا، پاشان بۆ هەنگاریا بۆ کارێکی تایبەت، هەڵبژاردەکانی نەمسا و هەنگاریا و وڵاتانی سەر ڕووباری دانووب، بوون بە خاوەنی فۆرمێکی جیاوازی تۆپی پێ. دوای چەند ساڵێکی تر، هەنگاریا لەگەڵ ئینگلتەرا یاری کرد و بە ئەنجامێکی مێژوویی یاریەکەی بردەوە.

## سێ یەم : دروستکەری شکۆمەندییەکانی ئارسیناڵ و تەکتیکی (WM)

بە تێپەڕبوونی کات یاریەکە هەنگاوی تری وەردەگرت، وەك چۆن تیپەکانی تر سەرکەوتوبون لە تێگەیشتنی تۆپی پێ بە گۆشەنیگایەکی جیاوازتر، ئەوا ئینگلیزەکانیش دووبارە گەڕانەوە بۆ دەست بەسەراگرتنی تۆپی پێ، چاکەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پیاوەی کە مێژووی ئارسیناڵی دروست کرد، ئەو هێلبێرت چاپمان (١٨٧٨-١٩٣٤) ڕاهێنەری خاوەنی پلانی (WM)ە، تێکشکێنەری یاسا نوێکانی ئۆفساید لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا.

## كێشەی ئۆفسايد

يەكێتی تۆپی پێی ئينگليزی هەستا بە ڕێكخستنی ياساكانی ئۆفسايد لە ساڵی (١٩٢٥)دا، ئەم كارەش سودێكی زۆری بە تۆپی پێ گەياند، دەقی ياسا نوێكە بەم شێوەيە بوو: تەنها بوونی دوو ياريزان بەسە بۆ ئەوەی ياريزانی دژبەر لە دۆخێكدا بێت كە وای لێ بكات گۆڵ تۆمار بكات دوور لە تەڵەی ئۆفسايد. لە ڕابردوودا لە پێش هاوينی ساڵی (١٩٢٥)دا، پێويست بوو بە لايەنی كەمەوە سێ بەرگريكار "بەزۆری دوو بەرگريكار و گۆڵچی" لە نێوان هێڵی گۆڵ و كۆتا هێرشبەر بوونی هەبێت بۆئەوەی ياريەكە بەردەوام بێت. دواتر چەندين فێڵ بەكار دەهێنرا لە لايەن بەرگريكارانەوە بۆ ئەوەی ياريەكە بە هەژماركردنی ئۆفسايد بوەستێت.

بۆ نمونە، زۆربەی پلانەكان كە پێشتر باسمان كرد نزيك بوون لە پلانی (٢ – ٣ – ٥)، دواتر كاتێك دووان لە سێ ياريزانەكەی ناوەڕاست سەردەكەون بۆ پێشەوە، تەنها دوو بەرگريكارەكە لە دواوە دەمێننەوە، لەگەڵ بوونی هەر هێرشبەرێك لە بەردەمياندا، ڕاستەوخۆ هێرشبەرەكە دەكەوێتە ئۆفسايدەوە، لەبەرئەوەی ياسا تازەكە پێويستی بە سێ بەرگريكار هەيە بۆ شكاندنی و ئۆفسايد هەژمار نەكرێت.

گۆڕينی ياساكانی ئۆفسايد كاری كردە سەر درێژكردنەوە و

فـراوان کردنـی یاریگـە، لـە ڕابـردوودا ئاسـان بـوو هێرشـبەری دژبـەر بخرێتە ئۆفـسایدەوە بـەهۆی مـەرجی سـێ بـەرگریکار، بـەڵام لەگـەڵ توانینی شکاندنی ئۆفسایدی بە بوونی تەنها دوو بەرگریکار، کاری کردە سەر زۆربوونی ماوەی یاری ڕێگەپێدراو و بەرزبوونەوەی ڕێـژەی گـۆڵ بەشێوەیەکی بەرچاو.

## تەکتیکی دەبلیو ئێم WM

ڕەنگە چاپمان ئەو کەسە نەبێت کە تـەنیا تـەکتیکی (WM)ی داهێنابێت، بەڵام ئەو کەسـە بـوو جـوانترین و تـەواوترین وێنـەی ئـەو تەکتیکەی دەرخست. شێوازە نوێکە بە ڕێکخستنی بـەرگری دەسـتی پێ کرد، کە چاپمان هەستا بە دانـانی یاریزانێـك لـە ناوەڕاسـتەوە بـۆ بەرگری، نیوەی یەکەمی یاریگە هاوشێوەی پیتی (M) لێ بێت، واتـا سـێ یـاریزان لـە ناوچـەی بـەرگری لەگـەڵ دوو یـاریزان لـە ناوچـەی ئێرتیکازدا.

ناوچەی هێرشبردنیش دابەشکرا بەسەر دوو یاریزان لـە دواوە و سـێ یـاریزان لـە پێـشەوە هاوشـێوەی پـیتی (W)، لەمـەوە ناونـانی پلانـی ئارسـینالی چـاپمان بـە نـاوی (WM) هـات، ئـەم شـێوازی یاریکردنـە لـە یاریگـە جیاوەزەکـانی بـەریتانیا بڵاوبوویـەوە، یانـە لەندەنیەکە لەسەر دەسـتی ڕاهێنـەرە ناوازەکـە چـەندنین پاڵـەوانێتی بەدەست هێنا، لـە ئـەنجامی سـەرکەوتنیان لـە جێبـەجێکردنی پلانـە نوێ و جیاوازەکە.

هەرەمی هەڵگەڕاوە




پێکهاتەی فینالی FA Cup، ئارسێناڵ ٢ – ٠ هادەرسفێڵد، یاریگەی وێمبلی، لەندەن، ٢٦ / ٤ / ١٩٣٠

شێوازی یاریکردنی ئارسیناڵ نزیك بوو لە (٣ – ٢ – ٢ – ٣)، لە حاڵەتی بەرگریدا ئەم شێوازە دەبوو بە (٥ – ٣ – ٢)، لە حاڵەتی هێرشبردنیشدا دەبوو بە (٣ – ٤ – ٣). ئەم ستراتیژە لەسەر

چاودێری یاریزان بۆ یاریزان (man to man) لە نیوەی یاریگەی خۆیان بونیات نرابوو، بەرگریکردن لە ناوچەکە لە نیوەی یاریگەی دژبەر. هەربۆیە ئارسینالّ بە پـچڕاندنی خێرا لە دواوە بۆ پێشەوە هێرشی دەبرد، پاسێك لە کۆتا یاریزانەوە بۆ ناوەند، کە بەخێراییەکی زۆرەوە دەیگوازێتەوە بۆ هێرشبەری دواکەوتوو، یاریساز بۆ سێ یاریزانی پێشکەوتوو لە کۆتایی یاریگەدا، چەند لەمسەیەکی کەم و هەموو شتێك کۆتایی پێ دێت.

## لە یانەکانەوە بۆ هەڵبژاردەکان

کاروانی وەرزشی چاپمان لەگەڵ تۆپی پێدا ئاسایی نییە، بەتایبەتی لە ئاستی ڕاهێنەرایەتیکردندا، لەبەرئەوەی ڕاهێنەرایەتی هەر یانەیەکی کردبێت جێ دەستی خۆی جێ هێشتووە. سەرەتا لەگەڵ یانەی نۆرسامتۆن پاڵەوانێتی خولی باکووری ئینگلتەرای بەدەست هێنا، پاشان یانەی لیدزیونایتد و گۆڕینی بۆ تیپێکی بەهێز، کە توانای بردنەوە و شەرمەزارکردنی گەورەکانی هەبێت، پاشان یانەی هیدسفیڵد و گەیشتن بە لووتکە لەگەڵ ئەم یانە ئاساییە بە بردنەوەی یەك جام و پاشان دوو خولی یەك لە دوای یەك.

لە کۆتاییدا لەگەڵ یانەی ئارسینالّ و مێژووە جوانەکەی بە سێ جار گەیشتن بە یاری کۆتایی جام و بردنەوەی یەك جاریان، هەروەها

دوو جار بەدەست هێنانی خولی ناوخۆیی بە تۆمارکردنی خاڵی مێژوویی، پاشان مردنی لەناکاوی، دوای ئەوەی تیپی ئارسیناڵی گەیاندە لووتکەی تۆپی پێی بەریتانی بەبێ ڕکابەر. بەڵام تۆپی پێ بەردەوامی هەیە و لەسەر هەنگاوێکی دیاریکراو، یان بیرۆکەیەك ناوەستێت.

## چوارەم: هۆگۆ مایزڵ و (میتۆدۆ)ی پۆزۆ

یاریەکانی تۆپی پێ تەنها لە نێو یاریگەدا ئەنجام نادرێت، لە نێوان (١١ یاریزان لە دژی ١١ یاریزان)، بەڵکو لە دەرەوەی هێڵەکانیشدا لە نێوان ئەو قوتابخانانەی تۆپی پێ کە هەوێنێك بوون لە جیهانی تەکتیکدا ئەنجام دەدرێت، بە هەوڵدان و ماندووبوون و سووربونیان، کۆمەڵێك بنەما و بیرۆکە و ڕەوشتیان بونیات ناوە، تاکو ئێستا هەموو ئەوانەی بڕیاریان داوە لە جیهانێکی نزیك لە تۆپی پێدا بژین، لە سەری دەڕۆن.

## خانووی قاوە

شێوازی یاریکردنی دانوبی پشت دەبەستێت بە شێوازی یاریکردنی (٢ – ٣ – ٥) یان تەکتیکی هەرەم ( The Pyramid)، بەڵام لەگەڵ داینامیکیەتی زۆرتر و پاساتی وردتر و تۆپی خشکەیی، نەك تۆپی بەرز لەسەر شێوازی ئینگلیزەکان.

هەربۆیە یاریکردنی مایزڵی ڕاهێنەر سەرنج ڕاکێش و هەژێنەر و خۆش بوو تا ڕادەیەکی باش. تەکتیکێك داوا لە بەرگریکاران دەکات بەهێز بن لە تەمەرکوز و پێشبینی کردن، لەبەرئەوەی ئەوان بە تەنیا تەواوی هێڵی دواوە دادەپۆشن.

هۆگۆ مایزڵ (١٨٨١ – ١٩٦٨) ئەو پیاوەی خاوەن کڵاوە بەناوبانگەکە بوو، بەردەوام لە کاتی یاریەکان و پاش یاریەکاندا لە سەری دەکرد. بەڵام تەنها کڵاوەکەی خاڵی جیاکەرەوەی ئەم بلیمەتە نەبوو، بەڵکو کارە جوان و بیرۆکە نوێکانی لە تۆپی پێدا بوو، هۆکارگەلێك بوون وایان لێکرد لەچاو زۆرکەس یەکێك بێت لە باشترین ڕاهێنەرەکانی نیوەی سەدەی بیستەم.

شێوازی یاریکردنی هەڵبژاردەی نەمسا لەسەر دەستی مایزڵ لەو دەمەدا پشتی دەبەست بە شێوازی یاریکردنی هێرشبردن، تەنها دوو بەرگریکار لە دواوە لەسەر شێوازی هەرەم، سێ یاریزانی تەواو لە ناوەند، فێڵە گەورەکە لە پێنج یاریزانەکەی پێشەوە بوو، بەشێوەیەك سیندلاری هێرشبەری سەرەکی ڕۆڵی نزیك لە هێرشبەری وەهمی دەبینی، بە گەڕانەوەی بەردەوامی بۆ دواوە، لە پێناو ڕێگەدان بە هاوڕێکانی بۆئەوەی بەردەوام بێنە ناو ناوچەی سزا، یانی شێوازی یاریکردنی نزیك لە (٢ – ٣ – ٤ – ١).

## شێوازی ئیتاڵی

لە ساڵی ١٩٣٤ ئیتاڵیا میوانداری مۆندیالی کرد، ئەو کاتە ئیتاڵیا لە ژێر زەبر و زەنگی مۆسۆلێنی دیکتاتۆردا بوو، هەموو جولاّنەوەکانی تیپە شین پۆشەکەی هەنگاوبەهەنگاو تەماشا دەکرد، ڕاستە هەندێکجار بەخت یاوەری خاوەن ماڵ بوو، بەڵام تیپەکەی پۆزۆ سەرنجی چاودێرانی بە لای خۆی ڕاکێشابوو لە لێهاتوویی و وورەبەرزیدا.

ڤیتۆریۆ پۆتزۆ (١٨٨٦ – ١٩٦٨) سەرکردەی ئەو نەوە زێڕینەی ئیتاڵیا بوو، داهێنەری پلانی (میتۆدۆ) بوو، کە ئیتاڵیای کردە خاوەنی دوو مۆندیالی یەك لەدوای یەك، لەگەڵ تەرکیز خستنە سەر هەموو لایەنەکانی بەرگری و ئەنجامدانی هێرشی هەڵگەڕاوەی کوشندە، لەو کاتەدا تۆپی پێی ئیتاڵی پەیوەست بوو بە ڕاهێنەرانی بەرگری، شێوازی یاریکردنی داخراو کە لە کۆتاییدا ناسناو و پاڵەوانێتیەکان بەدەست دەهێنێت.

هەروەك چۆن تەکتکی نەمساییەکان هەڵقوڵاوی پلانی هەرەمەکە بوو، ئیتاڵیەکان پلانی (WM)یان هێنا و کەمێك گەشەیان پێدا و پێشیان خست. بە بوونی دوو بەرگریکار لە دواوە و لە بەرامبەریاندا سێ یاریزانی ناوەند لەسەر شێوەی پیتی (W)، لەگەڵ پاراستنی شێوەی هێرشبردنی ئینگلیزی، دوو یاریزان و سێ یاریزانیش لەسەر شێوەی پیتی (W)، بەم شێوەیە پلانی (٢ – ٣ – ٢ – ٣) پێکهێنرا کە بە (میتۆدۆ) دەناسرێت.

## یەکەم کلاسیکۆ

ئـەم ڕووبەڕووبوونـەوە بـە یەکـەم کلاسـیکۆی ڕاسـتی سـەدەی بیستەم دادەنرێت، لە نێوان تیپێك بە شێوەی هێرشبردن یاری دەکات و تیپەکەی تر کـەمێك داخـراو، هەڵبـژاردەی ئیتاڵیـای خـاوەن یاریگـە و هاندەر بە سەرکردایەتی ڤیتۆریۆ پۆتزۆ یاری دەکرد، لەگەڵ شێوازی (٢ – ٣ – ٢ – ٣)، کلیلی پلانەکە مۆنتی یـاریزانی ناوەڕاسـتی دواکـەوتوو بـوو، کـە لـە کـاتی پێویـستیدا دەگەڕایـەوە بـەرگری و پاسـی دەدا بـە لاکان.

بەڵام نەمسا بە شێوازی (٢ – ٣ – ٥)ی هێرشـبردن یـاری دەکـرد بە سەرکردایەتی هۆگۆ مایزل، دوو یاریزانی بەرگری پاشان سیمیستیکی یاریـسازی دواکـەوتوو لـە چـەق لـە لای ڕاسـتی وانگـەر و لـە لای چـەپی ئۆربانیك، لە کاتێکدا بێکان و چـاڵ وەك دوو هێرشـبەری دواکـەوتوو لـە دوای سـیندیلاری هێرشـبەری جـوڵاو و دوو یـاریزانی لاکـان ڤیتیـل و زیچیك. دوو یـاریزانی بـەرگری پاشـان سـێ یـاریزان لـە ناوەڕاسـتدا، لـە لایەکی ترەوە هێرشبردن پێك دێـت لـە دوو یـاریزانی دواکـەوتوو لەگـەڵ سـێ یـاریزانی پێـشکەوتوودا، لـە کـاتی پێویـستدا سـیندیلار دەچـێتە پێشەوە و چوار یاریزان لە دواوەی لە سێ یەکی کۆتاییدا.

یاری لوتکە لە بەرژەوەندی ئیتاڵیا بـە ئـەنجامی (١ – ٠) کۆتـایی هـات، پـۆتزۆ و هاوڕێکـانی بـەردەوامبوون لـە دروسـتکردنی مێـژوو بـۆ ماوەی چەندین ساڵ.




پێکهاتـەی چـوار گۆشـەی زێـڕینی مۆنـدیالی ١٩٣٤، ئیتاڵیـا ١ – ٠ نەمـسا، یاریگەی سانسیرۆ، میلان، ٣ / ٦ / ١٩٣٤

## پێنجەم: گەرمی تۆپی پێ لە کاریگەری ڤۆدکا دەباتەوە

هەوادارە کۆنەکانی تۆپی پێ نرخ و سەنگی یەکێتی سۆڤیەت لە وەرزش دەزانن، بەتایبەتی ئامادەبوونی بەردەوامی هەڵبژاردەکانی لە پاڵەوانێتیە جیاوازەکانی جیهان و یاریەکانی ئۆلۆمپی، لە نێوانیاندا تۆپی پێ. یانەکانی ڕوسیا و ئۆکرانیا بە ئارەزووی خۆیان لە نێو کیشوەرە پیرەکە تەراتێنیان دەکرد، چی لە ئاستی یانەکان یان وەك هەڵبژاردەیەکی یەککرتوو، کە هەردووتیپەکەی پێکەوە کۆدەکردەوە، هەربۆیە هەرەمی هەڵگەڕاوە تیشکێکی زۆری خستۆتە سەر جادوویی تۆپی پێ، کە سەرەڕای جیاوازی کات و شوێن بەفری مۆسکۆی تواندەوە.

### تۆپ یان ڤۆدکا؟

زستانی ١٨٩٠ لە مۆسکۆ، هاری شارنۆکی ئینگلیزی لە یەکێك لە کۆمپانیا گەورەکانی روسیا کاری دەکرد، بەدەست سەرما و سۆڵە و کەش و هەوایەکی نامۆوە دەینالاند، کە ڕێگری دەکرد لە چوونە دەرەوەی لەگەڵ هاوڕێکانی لە ڕۆژانی پشووە سارد و سەختەکاندا، هەربۆیە هەر کەسە و ناچار لە ماڵی خۆی دادەنیشت، لە پێناو دەستخستنی شوێنێکی ئارام و گەرم لە ناو ژیانێکی بێ تازەگەرییدا، ڤۆدکایان دەخواردەوە.

خێرا ئاشقەکەی بلاك بێرن ڕۆڤەرز بیری کردەوە لە ئەنجامدانی

شتێکی جیاواز، بۆ ئەم مەبەستەش دەستی کرد بە کۆکردنەوەی ئەو کەسانەی دەیناسین، بۆئەوەی لە شوێنێکی دیاریکراودا کۆببنەوە، بە شێوەیەکی کرداری دەستی کرد بەفێرکردنی بنەماکانی تۆپی پێ پێیان. بیرۆکەی ڕاکردن لە ڤۆدکا هەوێنی سەرەکی بوو لە دروست کردنی یەکەم یانەی یەکێتی سۆڤیەت، دینامۆ مۆسکۆ لە سەرەتادا ڕەنگی درێسەکەی هاوشێوەی ڕەنگی درێستی تیپی بلاك بێرن رۆڤەرزبوو، کە نیشتیمانی ئاشقە ئینگلیزیەکەیە.

دوور لە سەرەتاکان و نهێنیەکانی، بەڕاستی تۆپی پێی ئەورووپای ڕۆژهەڵات قەرزاری دوو کەسە، کە بەشێوەی سەرەکی یارمەتیدەربوون لە بەرەوپێش بردنی تەکتیك لەوێدا، یەکەمیان پسپۆڕی هونەری بۆریس ئەرکادیف (١٨٩٩ – ١٩٨٧)، ئەو پیاوەی کە هەستا بە دانانی کتێبی (تەکتیکەکانی تۆپی پێ)، کتێبەکەش بوو بە سەرچاوەی هەموو ڕاهێنەرەکانی یەکێتی سۆڤیەت، دووەمیان ڤیکتۆر ماسلۆڤ (١٩١٠ – ١٩٧٧) بوو، ڕاهێنەری تایبەت بە چۆنێتی ئەنجامدانی فشاری بەرز لە نێو لاکێشە سەوزەکەدا.

## فەوزای ڕێکخراو

هەموو تیپەکانی ئەورووپا بە پلانی (WM) یاریان دەکرد، هیچ ڕاهێنەرێك بیری لە گۆڕین و پێشخستنی نەدەکردەوە، هەربۆیە زۆربەی یاریەکان هاوشێوەی یەك بوون و نزیك بوون لەیەك، ئەم کارە کاردیفی زۆر پەست کرد، وای لێ کرد چەندین جار بیربکاتەوە بە گەیشتن بە تەکتیکێکی نوێ، کە ببێت بە سەرەتایەکی ڕاستی سەرکەوتن بەسەر ئینگلیزیەکان لە ڕووی هونەریەوە لە دەرەوەی یاریگەدا.

ڕاهێنەرە زیرەکەکە بڕوای بە جیهانێتی تەکتیك هەبوو، گەیشت بە قەناعەتێکی تەواو کە جوڵە بونیاتی یاریە، پێویستە لەسەر هەموو یاریزانەکان بەردەوام بجوڵێنن و لە شوێنێکی دیاریکراودا ڕانەوەستن، ئەوە بنەمایەکە نزیك لە بیرۆکەی تۆپی سەراپاگیری (كرة شاملة)، فەلسەفەی پڕکردنەوەی بۆشاییەکان کە لەم ساڵانەی دواییدا زۆر بە بەهێزی بڵاوبوویەوە، هەربۆیە ئەرکادیف فەرمانی کرد بە یاریزانەکانی بە پێویست بوونی یاریکردنیان لە سەرجەم ناوچەکاندا، هێرشبەرەکان تەنها لە ناوچەی سزا ڕانەوەستن، بەڵکو تەنها یەك یاریزان بەسە، بەڵام ئەوانیتر لە سێ یەکی کۆتاییدا دەگۆڕدرێن.

هەروەها هەمان حاڵەت بۆ یاریزانانی بەرگری، فەوزای ڕێکخراو بوو بە هێمایەکی بنەڕەتی تیپی دینامۆ، بەشێوەیەك زۆربەی گۆڵی

یاریزانانی باڵەکان لە نێو ناوچەی سزادا بوون، هەموو جوڵەکانی هێرشبەری تەواو لە لاکاندا بوو، بە پاڵپشتیەکی تەواوی یاریزانانی ناوەند و بەرگری، لێرەدا بەڕێوەبەری هونەری بونیاتی نوێگەری لە تۆپی پێدا دانا، قایل نەبوون بەوەی ئەوانیتر بەدەستیان هێناوە.

## فشاری بەرز

کردەوەی هەڵگەڕانەوە لە سێ یاریزانەکەی دواوە لە ناوەندەکانی سۆڤیەت دەستی پێ کرد، سەرەتاکەی لە دینامۆ مۆسکۆی ئەرکادیف بوو، پاشان دینامۆ کییەڤ ڤیکتۆر ماسلۆڤ، یەکەم هەنگاو لە گەڕانەوەی یاریزانی ناوەڕاست بۆ دواوە بوو، لە پێناو پاڵپشتی کردنێکی سێ یاریزانی دوواوە و پێدانی هەل بۆ دوو یاریزانی لاکان بۆ ئەوەی بەرەو پێشەوە بجوڵێن.

لە پێناو گەڕانەوە لە یاری تاکە کەسیەوە بۆ یاری بەکۆمەڵ، هێرشبەری دواکەوتوو دەگەڕێتەوە بۆ دواوە بۆ شوێنی یاریزانانی ناوەند، بەم شێوەیە سیاسەتی ڕاگوێزانی ناچاری تەکتیکی بڵاوبوویەوە، واتا هەموو یاریزانێك شوێنی هاوڕێکەی پڕ دەکاتەوە و بەم شێوەیە، ئەم بیرۆکەیە بوو بە یەکەمین کرداری ڕاستی بۆ ناساندنی تۆپی پێی نوێی تایبەت بە Zonal Game.

لە پلانی (٣ – ٢ – ٣ –٢)ەوە بۆ پلانی (٤ – ١ – ٢ – ٢) بە گەڕانەوەی یاریزانێکی ناوەند بۆ بەرگری، پێش گەڕانەوەی

یاریزانێکی سیانەی ناوەندی پێشکەوتوو بۆ دواوە، پلانەکە بوو بە (٤– ٢ – ٢ – ٢)، ئەم شێوازی یاری کردنەش بوو بە پاڵنەرێکی گرنگ بۆ دروستکردنی زۆرترین فشاری لەگەڵ ماسلۆۋ لە ئۆکرانیادا، بەچێژترین تۆپی پێی لاتینی لەگەڵ بەرازیل لە ئەمەریکای باشووردا.

**شەشەم: قوتابخانەی هەنگاری دەرگاکانی لە ویمبلی دەکاتەوە**

"کوڕی وڵاتەکەتان سودێکی زۆری پێ گەیاندین، جیمی هۆگان جێگای تایبەتی خۆی لە نێو دڵی هەموو هەنگاریەکاندا هەیە". ڕاستەوخۆ پاش یاریەکە، ڕۆژنامەنووسە ئینگلیزیەکان سەریان سوڕما لەم وتەیەی ساندۆر بارش (١٩١٢ – ٢٠١٠)ی سەرۆکی یەکێتی تۆپی پێی هەنگاریا. چیرۆکەکە زۆر نامۆیە و وردەکاریەکانی زۆر دورن لە یەکتری، هەڵبژاردەیەك ئینگلیزی و ئەوی تر هەنگاری، قسەی کۆتایی دەگەڕێتەوە بۆ پیاوێکی ئینگلیزی، کە لەو دەمەدا ڕاهێنەری هیچ کام لەو دوو تیپە نەبووە، بۆنەکەش ناوبانگترین یاریە لە ئینگلتەرا لە یاریگای ویمبلی ئەنجام درابێت، ئەو یاریەی کە بە ناوی "ڕوبەڕوبونەوەی سەدە" ناسراوە.

**ئێم ئێم (MM)ی هەنگاری**

لە ساڵانی سەرەتای تۆپی پێدا، شێوازی یاریکردنی (MM) دەستی بەسەر یاریەکەدا گرتبوو، سەرەڕای پێشکەوتنێکی ڕوون لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا و ئەمەریکای لاتیندا، بەڵام زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا بەسەرکردایەتی ئینگلتەرا پارێزگاریان لەو پلانە دەکرد، لە

ئاستی یانە و هەڵبژاردەکان هەمووان بەکاریان دەهێنا، تاکو یاریەکە لە هەندێك کاتدا جۆرێك لە بێتام و بێ چێژی بەخۆوە دەبینی، بەهۆی لێك چوونی ڕوونی شێوازی یاریکردنی ڕکابەرەکان لە نێو یاریگەدا.

مـارتن بۆکـۆڤی (۱۹۰۳ – ۱۹۸۵) ڕاهێنـەری تیپـی (MTK) هەنگاری، ئەو پیاوەی زۆر هەوڵیدا شێوازی یـاریکردنی ئینگلیزیـەکان جێبەجێ بکات لە یاریگادا، بەڵام دووچاری نەبوونی هێرشبەری تەواو بوویەوە، کـە بـەهێز و گۆڵکـار بێـت، توانـای قۆستنەوەی بچوکترین دەرفـەتی هـەبێت و گـۆڵی پـێ تۆمـار بکـات. هەربۆیـە بەڕێوەبـەری وەرزشی بیرۆکەی دانـانی یـاریزانێکی بـاڵ بـۆ ئـەو شـوێنە بـۆ هـات، پاشان کەمێك گەڕانەوەی یاریزانەکە بۆ دواوە، لە پێناو پێدانی هـەل بۆ هاوڕێکانی بۆ تۆمارکردنی گۆڵ.

ڕاهێنەرەکە دەستی کرد بە دۆزینەوەی پلانێکی نـوێ، کـە بـە تەواوی بیرۆکەی (WM) تێك بشکێنێت، کە پێویستی بە یـاریزانێکی سەرەڕمی کلاسیکی و دوو یاریزانی ناوەڕاست لە شێوەی بەرگریکاردا هەیە. گۆسـتاڤ سێبـسی کـاپتن هەسـتا بـە گەشـەپێدانی ئـەم پلانـە، گۆڕینی بۆ نمونەیەکی ناوداری تۆپی پێ لەو دەمـەدا، هەربۆیـە تیپـی هەنگاری بیری کردەوە بە جوڵاندنی هێرشبەری سەرەکی بـۆ ئـەوەی بێت بۆ ناوەڕاست، لەگەڵ دانانی دوو یاریزانی ناوەند لە چـەقەوە بـە شێوەی پێچەوانەوە، یەکێکیان ڕۆڵی هێرشبردن ببینێت بە هاوڕێـەتی هێرشبەری وەهمی دواکەوتوو، ئەوی تریشیان بگەڕێتەوە بۆ دواوە بۆ

یارمەتیدانی یاریزانی ئێرتیکاز لە چەقەوە لە ئەرکە بەرگریەکەی و پاسدانی تۆپەکان بۆ پێشەوە، شێوازەکە نزیك بوو لە (٢ – ٢ – ٢ – ٢ – ٢) یان بەشێوەیەکی ڕوونتر (٢ – ٣ – ٢ – ٣)، کە ناسراوە بە (ئێم ئێم MM).




پلانی (٢–٣–٢–٣)، ناسراو بە (MM) هەنگاری

## میسی پەنجاکان

هیدکۆتی لە شوێنی باڵ لەگەڵ هەڵبژاردەی هەنگاریادا یاری دەکرد، بۆ ماوەیەکی درێژ لەم شوێنە بەردەوامبوو، تاکو یاری نێوان هەنگاریا و سویسرا، کە تێیدا هەڵبژاردەی وڵاتەکەی بە دوو گۆڵی بێ بەرامبەر لە دواوە بوو، ڕاهێنەری هەنگاریا هەستا بە گۆڕانکاری کردن لە شوێنەکان لە نێو یاریگادا، هیدکۆتی شوێنەکەی لە لاوە جێهێشت و بوو بە هێرشبەری وەهمی دواکەوتوو لە بەردەم هێڵی ناوەند لە شوێنی هاوڕێکەی بالوتاس، هەنگاریا دواکەوتنەکەی گۆڕی بۆ بردنەوەیەکی بەهێز بە ئەنجامی (٤ – ٢)، هیدکۆتی تاکو کاتی وازهێنانی لە تۆپی پێ پارێزگاری لە شوێنە نوێکەی کرد.

ئەو شوێنە شوێنێکی تەکتیکی نزیک لە ڕۆڵی میسی لە سەردەمی گواردیۆلا بوو، ئەوە هێرشبەری درۆزن بوو، کە لە هەموو شوێنێکی سێ یەکی کۆتاییدا بوونی دەبێت، بەرگریکارەکانی لەگەڵ خۆیدا دەکێشێتەوە دوور لە ناوچەی سزا، بە ئارەزووی خۆی لە نێوان هێڵەکاندا هاتووچۆ دەکات. شوێنەکانی یاریکردن لە پێشوودا پشتی دەبەست بە شوێنی یاریزانەکان، وەك بەرگریکاری دواکەوتوو ژمارە ٥ دەپۆشی، باڵی چەپ ژمارە ٧ دەپۆشی، هێرشبەری سەرە ڕم ژمارە ٩ دەپۆشی.

هیدکۆتی بە ژمارە ٩ پەیوەست بوو، ئەم کارەش سەری لە بەرگریکارەکان تێک دەدا، لەبەرئەوەی ئەو ئەرکەکانی ژمارە ٩ تەقلیدی ئەنجام نەدەدا، بەڵکو لە هەموو شوێنێکی یاریگادا دەبینرا. هەربۆیە هاری جۆنی بەرگریکاری ئینگلیزی لە یادەوەریەکانی نووسیویەتی :" بەڕاستی شکستم هێنا لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ هیدکۆتی هەر کاتێك ڕووبەڕووی بوومەتەوە، ئەگەر لە گەڵی بڕۆم بۆ ناوەڕاست، ئەوا بۆشایەکی گەورە لە دوای خۆم جێ دەهێڵم، ئەگەر وازی لێ بهێنم، بە ئازادی تۆپەکە وەردەگرێت و دەیدات بە هاوڕێکانی". هەربۆیە ئەم یاریزانە و ئەم کۆمەڵەیە پشتی کلاسیکێتی تۆپی پێیان شکاند.

## یاری سەدە




ئینگلتەرا ٣ – ٦ هەنگاریا، یاریگەی وێمبلی، لەندەن، ٢٥ / ١١ / ١٩٥٣

یاریـــەکی یـــەک لایەنـــە، پاســـاتی بەکۆمـــەڵ، جـــوڵانی خێـــرا، گواســـتنەوەی هێـــرش لـــە چـــەند چرکەیەکدا، هێرشـــی ترســـناک و

مەهارەی نائاسایی. هەنگاریا بە شێوازێکی نوێ ڕووبەڕووی ئینگلتەرا بوویەوە، نەك بیرۆکەی هێرشبەری دواکەوتوو بەڵکو پلانێکی نوێ و جیاواز و بلیمەتیانە، کە خۆی دەبینێتەوە لە: هێرشبەری وەهمی، جوڵەی زیرەکانە و پلانێکی بلیمەتیانە لە داپۆشینی شوێنی یەکدی لە کاتی هێرشی پێچەوانەدا.

دووانەی بۆشیك و زاکریاس هەڵدەستن بە ئەنجام دانی دوورخستنەوەی بەردەوام لە بەردەم لۆرانتیی کۆتا بەرگریکار، لەگەڵ پێدانی ئازادی تەواو بە دووانەی لاکان بۆ هاتنە پێشەوە بۆ یارمەتیدانی باڵە تەواوەکان. هیدکۆتی ڕۆڵی یاریسازی دواکەوتووی پشت دووانەی ناوەندی پێشکەوتووی ڕووبەڕووی ناوچەی سزا دەبینێت، یانی بەرگریکارێکی تەواو لە بەردەمیدا چوار یاریزان، هێرشبەرێکی دواکەوتوو لە بەردەمیدا چوار یاریزان، پلانێك نزیك لە (١ — ٤ — ١ — ٤) بە باشترین شێوەی جێبەجێکردنی بەپێی توانا.

سەرەڕای بەهێزی ئەم تیپە، بەڵام یاری کۆتایی مۆندیالی ١٩٥٤ بە ئەڵمانیای خۆرئاوا دۆڕاند، ئەو هەڵبژاردەیەی کە لە قۆناغی یەکەمدا بە هەنگاریا دۆڕا بە ئەنجامی (٣–٨) پێش ئەوەی یاری کۆتایی بە ئەنجامی (٣ — ٢) لێ بباتەوە، هەموو هەنگاریەکان لە هەڵبژاردە گەورەکەیان هەڵگەڕانەوە، تاکو هێرشیان کردە سەر پۆشکاش، لێدانی کوڕی سیبس لە قوتابخانەکەی، دەستگیرکردنی گۆڵپارێزەکە، تاکو دەست لەکارکێشانەوەی بەڕێوەبەری هونەری

تیپەکە.

تیبۆر ڤیلاسی گۆڵکاری بەتوانای هەنگاریا دەڵێت :"زۆر بە بەخت بووم کە سیبس لە گەڕەکەکەمان دەژیا، کە لە ماڵەکەی دەهاتە دەرەوە و ئێمە منداڵ بووین تەماشای دەکردین یاریمان دەکرد، پاش کۆتایی هاتنی یاریەکە، گوفتوگۆی لەگەڵ دەکردین و باسی یادگاریەکانی لەگەڵ هەنگاریا و بردنەوە مێژوویەکانی دەکرد بۆمان، ئەو ئامۆژگاری کردم بە بەردەوام بوون لە یاریکردن، بەڕاستی ئەو پیاوێکی گەورەیە، ژیانی لە پێناو تۆپی پێ بردە سەر.

## حەوتەم: ئەفرەت و کوڕە سەرگەردانەکە، تۆپی پێ

### دەبردرێتە بەرازیل

"چارلی چیت بەدەست هێناوە؟" ئەمە یەکەمین وتەکانی باوکێك بوو بۆ کوڕە بچووکەکەی، کە بەرازیلی جێهێشتبوو و ڕۆیشتبوو بۆ ئنگلتەرا بۆ هێنانەوەی زانست، بەڵام گەڕایەوە و دوو تۆپی پێ بوو، بە دلێرانە بەرامبەر باوکی ڕاوەستا و گوتی : "کوڕەکەت لە زانکۆی تۆپی پێ دەرچووە، بنەماکانی ئەم یاریە گەورەیە فێر بووە، بەڵێنی داوە بیگەیەنێتە سەرجەم کوچە و کۆڵانەکانی بەرازیل".

### گەڕێدە هەنگاریەکە

شۆڕشی تۆپی پێ لە هەنگاریاوە گواسترایەوە بۆ سویسرا و پاشان بۆ بەرازیل، کریشنەر (١٨٨٥ – ١٩٤١)ی یاریدەدەری هۆگان لە سویسرا گەشتی کرد بۆ بەرازیل بەدیاریکراوی بۆ شاری فلامینگۆ، لەپێناو ڕاهێنەرایەتیکردنی تیپە گەورەکە، لەو کاتەدا ڕاهێنەرە ئەورووپیەکە سووربوو لەسەر جێبەجێکردنی بیرۆکە بوێرانەکانی و تەواو جیاواز بوون لە پلانی (WM) کە وڵاتی کۆباکابانای داگیرکردبوو.

تا دەهات ڕەخنەکان لە دژی ڕاهێنەرەکە زیاد دەبوون، هەموان

تۆمەتباریان دەکرد بەوەی کە ئەو مرۆڤێکی سەروشکڵ جیاوازە، نازانرێت ئایا ئەو هەنگاریە یان سویسریە یان بەرازیلی، زۆر قسە ناکات لەگەڵ کەس، سوورە لەسەر جێبەجێکردنی بیرۆکەکانی بێ گوێدانە بەرامبەرەکەی، دوژمنێکی سەرسەختی پلانی (WM)ە، هەربۆیە خێرا دەستی کرد بە هەندێك گۆڕانکاری لە شێوازی یاریکردنی فلامینگۆ، لەمیشەوە بۆ سەرجەم تیپە بەرازیلیەکان.

کریشنەری ڕاهێنەر کۆتا بەرگریکاری هێنایە پێشەوە بۆئەوەی سێ یاریزان لە ناوەڕاست بێت، ئەم پلانە نزیکبوو لە پلانی (میتۆدۆ)ی ئیتاڵی، واتا شێوازی (٢ – ٣ – ٢ – ٣) کە ناسراوە بە (WW)، لە دۆخی بەرگریدا دوو یاریزان لە لاکان دەگەڕێنەوە دواوە، بەمەش چوار یاریزان لە بەردەم گۆڵەکەدا دەبێت، لەگەڵ سێ یاریزانی تر لە ناوەڕاست، سێ یاریزانیش لە هێرش بردن، بیرۆکەیەکی نزیك لە (٤ – ٣ – ٣) بەلام بە تەواونەکراوی مایەوە، چونکە ڕاهێنەرەکە پاش نزیکەی ساڵێك بەرازیلی جێهێشت، دوای ئەوەی بەردی یەکەمی لە ناوە بەستوەکانی بەرازیل دانا.

## ئەزموونی بەرازیلی




پێکهاتەی فینالی مۆندیالی ١٩٥٠، بەرازیل ١ – ٢ ئوروگوای، یاریگەی ماراکانا، ریۆدی جانێرۆ، ١٦ / ٦ / ١٩٥٠

هێرۆشیما لە بەرازیل؟ ئایا ئەم وتەیە دروستە یان تەنها زانیاریەکی هەڵەیە؟ ئەم ڕووداوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٥٠ بەدیاریکراوی لە یاری کۆتایی جامی جیهانی، ئەو کاتە بەرازیل لەسەر خاك و لە نێو هاندەرانی بەرامبەر بە ئۆرۆگوای لە فیناڵە مێژوویەکە دۆڕا، هاندەرانی بەرازیل بە دڵگرانی و خەمباریەوە گەڕانەوە ماڵەکانیان، بەشێوەیەك دەنگی گریانەکانیان لە گەڕەك و شوێنە جیاوازەکانی بەرازیل پاش ئەم فیناڵە شوومە دەبیستران.

لەڕووی تەکتیکیەوە، بەرازیل پاڵەوانێتیەکی جوانی پێشکەش کرد و بەرامبەر هەمووان لایەنی باشتر بوو، لەگەڵ پلانێکی نوێ و داهێنراو نزیك لە (٤ — ٢ — ٤) بەشێوەیەك کە لەو ڕۆژانەدا هەرگیز پەی پێ نەدەبرا، نهێنیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ یانەی فلامینگۆ و ڕاهێنەرە زیرەکەکەی فلاڤیۆ کۆستا (١٩٠٦ — ١٩٩٩)، ئەو پیاوەی کە جێ دەستی ڕاستەقینەی لەسەر هونەری تۆپی پێ لە ئەمەریکای لاتین دانا.

پاش هەوڵەکەی کریشنەر و ڕۆیشتنی، کۆستا هەموو بیر و هۆشی خستبووە سەر چۆنێتی گۆڕینی پلانی (WM)، یان (٣ — ٢ — ٢ — ٣)، دەستی کرد بە سڕینەوەی پلانەکە بە بەکارهێنانی هەندێك وێنەی ئەندازەیی، بە پاراستنی سێ یاریزان لە دواوە، لەگەڵ کەمێك گەڕانەوەی یاریزانێکی ناوەند، نە ناوەڕاستێکی تەواو و نە بەرگریکارێکی ڕاستی، بەڵکو یاریزانێك لە نێوان دوو ناوچەدا،

بۆئەوەی لەکاتی پێویستدا چوار یاریزان لەوێ بوونی هەبێت.

لەگەڵ کەمێك گەڕانەوەی یاریزانێك لە هێرشبردنی دواکەوتوو بۆ ناوەڕاست هاوشێوەی یاریزانی پێشوو، بە مانای ئەوەی نیوەی هێرشبەرێکی دواکەوتوو، نیوەی یاریزانێکی ناوەڕاست، لەگەڵ بوونی دوو یاریزان لە لاکان و هێرشبەرێکی تەواوی پێشکەوتوو، لە کاتێکدا یاریزانی چوارەم هەموو شتێك بوو، جارێك لە لاکان دەتبینی جاری واش هەبوو لە دڵی هێرش بردن، بەم شێوەیە، تاکو گەیشتن بە چۆنیەتی پلانەکە بەرەو لای ڕاست یان چەپ، لە نزیکترین شێوەی پلانی (٤ — ٢ — ٤)، ئایکۆنی هونەری داهاتووی تۆپی پێی بەرازیل.

## مۆرینیۆی هەنگاریا

هەنگاریەکان گەورەترین برگەکانی تۆپی پێیان لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا پێشکەش کرد، ڕاهێەرانیان بۆ تەواوی دونیا گەشتیان دەکرد، لە پێناو بڵاوکردنەوەی تۆپی پێ و تایپ کردنی بیرۆکەکانیان لە یاریگا جیاوازەکاندا، لە نێوانیانیاندا بیلا گۆتمان (١٨٩٩ — ١٩٨١)ی ڕاهێنەری مەزن، ئەو پیاوەی ڕووبەڕووی کارگێڕی بەنفیکا بوویەوە، پاش بردنەوەی چامپیۆنزلیگ بەهۆی جیاوازی پارەوە بەنفیکای جێهێشت، دڵنیایی کردنەوە کە پاش ئەم هیچ پاڵەوانێتیەکی گەورە بەدەست ناهێنن، لەم بەروارەوە یانە پورتوگالیەکە فینالەکان لە ئەوروپا دەدۆڕێنێت، کە لە ڕاگەیاندندا بە

"نەفرەتی بیلا گۆتمان" ناسراوە.

گۆتمانی ڕاهێنەر زۆر لە مۆرینهۆ دەچێت، لەبەرئەوەی گۆتمان ڕووبەڕووی هەموان دەبوویەوە، کەسێتی خۆی پێش هەموو یاریزانەکان دادەنا، بە شێوازێکی نزیك لەوەی مۆرینیۆ ئەنجامی دەدا لە یاریگەکانی ئینگلتەرا و ئەورووپادا. گۆتمان لە بەرازیل لەگەڵ ساوپاولۆ ئەزموونێکی جوانی هەبوو، سیلیساو زۆر سودیان لێ وەرگرت لە گۆڕینی پلانەکان و پێشخستنی، تاکو گەیشتن بە بەدەست هێنانی چەندین جامی جیهانی پاش ئەوە.

گۆتمان بڕیاری دابوو بە هەمان نەسەقی تەکتیکی (٤ — ٢ — ٤) یاری بکات، بەڵام بە خێراییەکی زۆرتر لە دروستکردنی هێرش لە بەرگریەوە بۆ هێرش بردن، هەربۆیە گۆتمان بە پلانێکی نوێوە نەهات بۆ بەرازیل، بەڵام مەودای هاوسەنگی پلانی بۆ ڕاهێنەرەکانی ئەوێ زیادکرد، تاکو ڤیسنتی ڤیۆلای ڕاهێنەری هەڵبژاردەی بەرازیل لە مۆندیالی ١٩٥٨ سوودی لەم بیرۆکانە وەرگرت، سیستمێکی تەکتیکی دەستکەوت کە هێرش بردنی مەهاری لەگەڵ بەرگریکردنی بەتین لە دواوە، بۆ دەستەبەر دەکات.

"کاتێك تۆپ وەردەگریت، ڕاستەوخۆ بیدە بە گارینشیا، تۆپی دووەم دەبێت بۆ یاریزانی باڵ بێت". ڤیسێنتی فیۆلا (١٩٠٩ — ١٩٧٥)ی ڕاهێنەر ئەم قسانە بە دیدی دەڵێت، کە ناوبراو هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی کاری ڕۆیشتنی خێرا بۆ لای گارینشیای باڵ، لە هەمان

کاتدا زاگالۆی باڵەکەی تردەگەڕێتەوە بۆ یارمەتیدانی ناوەند لە کاتی پێویستدا. هێرشبەرێکی تەواو لە هێڵی پێشەوە لەگەڵ پیلێ لە دواوەیدا، بەم شێوەیە بەرازیلیەکان گەیشتن بە سەرکەوتن، بە بیرۆکەی هونەری هاوردەکراو لە هەنگاریادا، مەهارەی لاتینی پوخت لە کەناراوەکانی ولاتی کۆبا کاباناد بلاوبوویەوە!




پێکهاتەی بەرازیل لە مۆندیالی ١٩٥٨

## هەشتەم: بەناوبانگترین پیاوی ئینگلتەرا

"ئەوان بەو شێوازە یاری دەکەن ئێمە پێش چەند ساڵێك بەکارمان هێنابوو، لەگەڵ هێزی جەستەیی زیاتر و پاڵەپەستۆی زیادە خستنەسەر، بەڵام بێ ستراتیژیەتێکی دروست، لەگەڵ ئوسلوبێکی زۆر دوور لە لایەنی تەکنیکی جیاکەرەوە" هێلێنیۆ هێرێرا (١٩١٠ – ١٩٩٧)ی ڕاهێنەری ئەرژەنتینی تیری ڕەخنەی ئاراستەی تۆپی پێی ئینگلیزی کرد، لە نێو لەندەنی پایتەختی تەماوی، ڕاهێنەرە ئەرژەنتینیەکە تۆپی پێی ئینگلیزی خستە نێو حاڵەتێك کە دەربازبوون لێی ئەستەم دەبێت، ناچاریشی دەکات بە گۆڕانکاریکردن لە کەسایەتیەکەیدا، وەگەرنا ڕۆژگار دەیبینێتەوە.

### کاڵای تۆپی پێ

ئینگلیزەکان تۆپی پێیان هەناردەی وڵاتە جیاوازەکانی دونیا کرد، ئەوانیش بە گواستنەوەی ئەزموونی تەکتیکیان بۆ یاریگەکانی بەریتانیا وەڵامیان دایەوە، هەربۆیە تیپەکان لە ئینگلتەرا هاوردەی بنەما هونەری و پلانەکانیان کرد کە بە تایبەتی لە هەنگاریا بڵاوبوویەوە، یاریکردنی هانگاریانە بوو بە چەکی دەستی ئەو تیپانەی دەیانویست لە پلانی (WM) هەڵبگەڕێنەوە.

ئارسەر ڕۆی (١٩٠٦ – ١٩٩٣)، ئەو ئینگلیزیەی کە بەشێکی ژیانی لە بۆدابست ژیاوە، دووبارە گەڕایەوە وڵاتەکەی، بۆ ئەوەی

تۆتنهام لە شکستە بەردەوامەکان ڕزگاربکات، لە پلە دووە سەری بخات و مێژوویەکی گرنگ بۆ یانەکەی باکوری لەندەن تۆماربکات، سەرکەوتوبوو لە گۆڕینی یاساکانی تۆپی پێ لە خولی ئینگلیزی، توانایی لە ئاوێتەکردنی پلانە ناوخۆیی و ئەوروپیەکاندل، لەگەڵ یەک دروشمی نەگۆڕ، ئەویش: "یاری کردن زۆر بە ئاسانی، یاری کردن زۆر بە خێرایی".

تۆپە درێژ و بەرزەکان باڵی کێشابوو بەسەر کەش و هەوای ئینگلیزی، ئارسەر لەگەڵ تۆتنهام زۆر تێکۆشا لەپێناو گۆڕینی ئەم خووە، هەربۆیە بە بەردەوامی فەرمانی دەکردە سەر یاریزانەکانی بۆ کەمکردنەوەی ئەم جۆرە پاسانە، لەگەڵ هەوڵدانی پاسدان لە مەودایەکی کەمدا بۆ هاوڕێیەکی تری نزیکی، گرنگتر پێش پاسدانەکە تەواوی تیپەکە بۆ پێش و پاش بجولێن، لەپێناو دروست کردنی بۆشایی پێویست وا بکات کۆتا پاس ترسناک بێت، بەم هۆیەوە تۆتینهام بە شێوەیەکی جیاوازتر لە ڕکابەرەکانی یاری دەکرد.

## بەناوبانگترین پیاوی ئینگلتەرا

ئەگەر پرسیار لە هاندەرانی ئینگلیزی بکەیت لەسەر باشترین ڕاهێنەری ئینگلیزی پەسەندکراویان، پێدەچێت وەڵامەکە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاواز بێت، بەڵام لە کۆتاییدا زۆرینەیان دەڵێن سێر ئاڵف ڕامسی (١٩٢٠ – ١٩٩٩) باشترینە، ئەو ڕاهێنەرەی ڕابەرایەتی ئینگلتەرای کرد لە بەدەست هێنانی گەورەترین پاڵەوانێتی لە مێژوویدا، ئەویش جامی جیهانی ١٩٦٦، لە سوپرایزێکدا ناوەندەکانی تۆپی پێی ئەورووپی و جیهانی هەژاند.

ڕامسی زۆر شت لە ئارسەری ڕاهێنەری فێر بوو، بەڵام تەنها لەسەر یاری خێرا نەوەستا، بەڵکو فەرمانی دەکردە یاریزانەکانی بە پێویستێتی یاریکردن لە شوێنی یاریکردنی جیاواز و خۆنەبەستنەوە بە یەك شوێن. هەربۆیە یاریزانی باڵ لە بەرگری یاری دەکرد لە کاتی ڕاهێنانەکاندا، لە کاتێکدا بەرگریکار بۆ پێشەوە دەجوڵا بۆ تێستکردنی هێرش بردن. لە کاتی ڕاهێنەرایەتیکردنی تیپی (ئیپ سویچ تاون)، بەڕێوەبەری هونەری یاریزانی باڵی کەمێك لە دواوە دانا، دوور لە گۆڵی نەیار و نزیك لە گۆڵی خۆیان، هەربۆیە یاریزانی نەیار هەوڵی نەدەدا لێی نزیك بێتەوە، وازی لێ دەهێنا تۆپ وەرگرێت و زۆر بە ئازادانە پاس بداتە هاوڕێکانی.

ئاڵف رامسی شوێنی پلانی (٤ – ٢ – ٤) کەوت لە سەر

شێوازی بەرازیلی، بەڵام لە بەرازیل (زاگالۆ) لە هێرش بردنەوە دەگەڕایەوە بۆ بەرگری بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکان، بەڵام بەهۆی نەبوونی یاریزانێکی بەچەشنی (زاگالۆ) لە ئینگلتەرادا، ئەم پیاوە بڕیاریدا لە سەرەتادا یاریزانێکی هێرشبەر لە ناوچەی ناوەڕاست دابنێت بێ گەڕانەوە، بەهۆی سەرکەوتنەکانی لەگەڵ تیپە لێهاتووەکەیدا، بڕیاری بەردەوام بوونی سەرکێشیەکەی دا لەگەڵ ئینگلتەرا لە شەستەکاندا.

## پاڵەوان

ئەو تیپانەی بە شێوازی (WM) یاریان دەکرد، دەیان نالاند بەرامبەر بەو تیپانەی کە بە شێوازی (٤ — ٢ — ٤) یاریان دەکرد، بەهۆی بوونی تەنها سێ بەرگریکار لە دواوەوە، بەرگریکارەکان لە بەرامبەر دوو هێرشبەری تەواو خۆیان دەبینیەوە، لەگەڵ دوو هێرشبەری جوڵاو کە زەحمەت بوو بە یەك یاریزانی ئازاد بوەستێنرێن، بەم هۆیەوە بیرۆکەی زیادکردنی بەرگریکارێکی زیادە و یاریکردن بە چوار بەرگریکاری تەواو لە بەردەم گۆڵچیدا هات.

ئاڵف ڕامسی بە ڕاهێنەرێکی واقعی و پراگماتیکی ناسراوبوو، لە مۆندیالی ١٩٦٦ چەندین شێوازی یاری کردنی بەکارهێنا، بە (٤ — ٣ — ٣) بە تۆپ یاری دەکرد، وە بە بێ تۆپ زۆر جار بە (٤ — ١ — ٣ — ٢) یاری دەکرد، هەروەك لە فیناڵە گەورەکەی بەرامبەر ئەڵمانیا

بڕیاری دا، هەڵبژاردەی ئینگلیز یەکەمجار پشتی بەپارێزگاری کردن لە گۆڵەکەی بەست بە بوونی چوار بەرگریکاری تەواو، لەگەڵ یاری کردنی بە لێسەندنی خێرا لە دواوە بۆ پێشەوە، پاساتی کەم و کاریگەری زۆر، گرنگی بیرۆکەکە بە دەست بەسەرگرتنی تۆپدا نەبوو بەڵکو ئەوەی گرنگە تۆپەکان بە خێرایی بێت و بڕوات.

چاڵتۆن ئەستێرەیەکی هەروا ئاسایی نەبوو، بۆ ئەوەی نەگەڕێتەوە بۆ بەرگری، ڕامسی دووانەی لاکانی خستە لای ڕاست و چەپی، لە پێناو هەڵگەڕانەوەی خێرا لە کاتی هێرشی هەڵگەڕاوەدا، شێوازەکە گۆڕدرا بۆ (٤ – ٣ – ١ – ٢)، بە بوونی چاڵتۆن وەك کاپتنی تیپ لە دواوەی دووانەی هێرشبەری پێشکەوتوو، لە کۆتاییدا ئینگلتەرا جامی جیهانی بەدەست هێنا. پاش ئەوەی دەستی هەڵگرت لە سیانەی بەرگری و بە شێوازی (٤ – ٢ – ٤) یاری کرد، سەرەتای هەقیقەتێك بوو کە دواتر ناسرا بە (٤ – ٤ – ٢) لەسەر شێوازی ئینگلیزی.

بەڵام سەرکەوتنی بەریتانیەکان بەردەوام نەبوو، بەهۆی گۆڕانکاریە پێویستیەکان لە یاساکانی تەکتیکدا، لەبەرئەوەی داهێنەری پلانی (٤–٤–٢) بەریتانی نییە، پرسیار لە ماسلۆڤ بکەن.

**هەرەمی هەڵگەڕاوە**




**پێکهاتــەی فینــاڵی مۆنـدیالی ١٩٦٦، ئینگلتــەرا ٤ – ٢ ئــەڵمانیای خۆرئـاوا، یاریگەی ویمبلی، لەندەن، ٣٠ / ٦ / ١٩٦٦**

## نۆیەم: شێوازی (٤ – ٤ – ٢) لە بنەڕەتدا سۆڤێتییە

شێوازی یاری کردنی (٤ – ٤ – ٢) بۆ ماوەیەکی درێژ باڵی بەسەر یاریگەکانی بەریتانیا کێشابوو، زۆربەی بینەران بڕوایان وابوو کە ئینگلیزەکان ئەم شێوازەیان داهێناوە، بەلآم خۆی لە ڕاستیدا پیاوێکی تر هەیە کە فەزڵی تەواوی هەیە بەسەر ئەوەی ناسراوە بە تەکتیکی نویێ، لەبەرئەوەی ئەو لە شەستەکانی سەدەی بیستەم لەگەڵ تیپی دینامۆ کییەف یاساکانی تۆپی پێی تازەی داناوە، ئەو کەسەیش ڤیکتۆر ماسلۆڤە، داهێنەری ستراتیژیەتی پەستان و بنیاتنەری شوێنی یاریساز بەو شێوەیەی کە پێویستە ببێت.

(٤ – ٤ – ٢)



دینامۆکییەڤی ڤیکتۆر ماسلۆڤ، پلانی (٤-٤-٢)

ماریۆ زاگالۆ ڕۆڵێکی تەکتیکی گرنگی بینی لە پێکهاتەی بەرازیل، ئەو باڵەی زۆر دەگەڕایەوە بۆ ناوەڕاست لەپێناو یارمەتیدانی دووانەی ئێرتیکاز، بەهۆی نەبوونی یاریزانێکی هاوشێوەی زاگالۆ لە پێکهاتەی ئینگلتەرادا، ئاڵف ڕامسی هەستا بە دانانی یەکێك لە دوو یاریزانی باڵەکان لە ناوەڕاست، بۆ گرەنتی پاراستنی بەرگری، کەچی ڤیکتۆر ماسلۆڤ زۆر لەوە دوورتر بۆی ڕۆیشت، بۆیە بڕیاری دا بە تێکشکانی بیرۆکەی دانانی دوو یاریزانی باڵەکان لەسەر هێڵ، ئەو دووانەی لە دڵی ناوچەی ناوەڕاستدا جێگیرکرد.

بەم گۆڕانکاریە ماسلۆڤ ویستی هێڵێکی ناوەڕاستی بەهێز و ئاسنینی هەبێت، پێك بێت لە ناوەندێکی بەرگریکاری تەواو، لە بەردەمیدا دووانەی تر لە چەقەوە لەخۆ بگرێت، لە شوێنێکی هاوشێوەی یاریزانی ڕیشەی ناوەڕاستی ئێستاماندا، لەبەردەم ئەم سیانەشدا یاریسازی پێشکەوتوو بۆ پێشەوە دەجوڵێت، لەسەر شێوازی (دیدی) ئەستێرەی هەڵبژاردەی بەرازیل، ماسلۆف ونبووەکەی لە (بیبا)ی بلیمەت بینیەوە، یەکێك لە بەهێزترین یاریزانانی ناوەڕاست لە مێژووی سۆڤیەت.

هەربۆیە پلانی (٤ — ٤ — ٢)ی ماسلۆڤ تا ڕادەیەك لە پلانی ئەڵماسی ئێستا دەچوو، بێ بوونی باڵی ڕاستی لەسەر هێڵ، بەم هۆیە هونەریەوە، ڤالێری لۆبانۆڤسکی سەرکەوتوو نەبوو کە دواتر بوو بە ڕاهێنەرێکی گەورە. یاریزانە ناودارەکە لە لووتکەی درەوشانەوەی بوو لەگەڵ دینامۆکییەف، بەهۆی جیاوازیە بەردەوامەکانی لەگەڵ ماسلۆڤدا هەر زۆر بە زوویی یانەکەی بەجێ هێشت، لەبەرئەوەی ڤالێری زۆربەی یارییەکان وەك باڵی مەهاری یاری کرد.

## Zonal Marking

لەپێناو لەکارخستنی یاریزانانی لاکان و پشت بەستنی تەواو بە یاریساز لە چەقەوە، ماسلۆڤ ویستی شێوازی (چاودێری ناوچە) بەکاربهێنێت، کە لەڕووی تەکتیکیەوە ناسراوە بە Zonal Marking، لە ڕێگەی چاودێری نەکردنی یاریزانێك بە یاریزانێکی

تر، بەڵکو تەنها چاودێری کردن لە ڕێگەی ناوچە، کاتێک یاریزانێکی ناوچەی ١ دەجولێت، ئەو یاریزانەی لەو ناوچەیە وەستاوە دەڕوات بۆی، بەڵام کاتێ ئەو یاریزانە لە ناوچەی٢ دەجولێت، هەمان یاریزان لەگەڵی بەردەوام نابێت، بەڵکو وازی لێ دەهێنێت بۆ یاریزانێکی ناوچەی٢، بەم شێوەیە...

ئەوە شێوازێکە بە سەرەتای تۆپی پێی سەراپاگیری دادەنرێت، لەبەرئەوەی تیپی دینامۆکییەف بەوە دەناسرایەوە کە تەنها لە یەک شوێن ڕاناوەستێت، لەپێناو پێدانی ئازادی زیاتر بە یاریسازەکە، پێویستی بە پاڵپشتی کردنی تەواوی لە دواوە دەکرد، هەربۆیە ماسلۆڤ بەرگریکارێکی تەواوی هێنایە ناو تیپەکە و لە ناوچەی ئێرتیکاز داینا، تۆریانچیک یەکەم یاریزانی ئێرتیکازی بەرگریە لە مێژووی تۆپی پێ.

تۆریانچیک لە بەردەم هێڵی بەرگری یاری دەکرد، بە لای ڕاست و چەپدا دەجولا، تاکو ڕێگە بدات بە تاکەکان بەرەو پێشەوە بێن، بەمەیش ئاسایشی تەواوی دەدا بە یاریسازی پێشکەوتوو تا بە ئازادی خۆی، یاری بکات. بەرەبەرە تیپەکە سەرکەوتوو دەبوو لە جێبەجێکردنی سیستمی بەرگری ناوچەدا، کە یارمەتیدەرێکی خێرابوو لە وازهێنان لە چاودێریکردنی تاک – بۆ – تاک و هاتوچۆکردنی ئازادانەی تیپەکە لە نێو پایەکانی لاکێشە سەوزەکەدا.

## فشاری بەرز

لەگەڵ ئەم شێوازەی یاریکردن و شوێنە نوێیەکاندا، ماسلۆڤ بڕوای تەواوی هەبوو بە فشاری بەرز لە سەرەتای یاریەوە تا کۆتایی، لەبەرئەوەی هەمیشە بڕوای وابوو خنکاندنی نەیار و بێبەشکردنی لە پاسدان، یەکەم هەنگاوی شکست هێنانیەتی. هەربۆیە تیپەکەی ماسلۆڤ بە زیاد لە یاریزانێك لە نیوەی یاریگەی نەیارەکەی یاری دەکرد، دووانەی هێرشبەر بە یاوەری چوار یاریزانی ناوەند، لەگەڵ هاتنە پێشەوەی دوو تاکەکە بۆ پێشەوە، هەربۆیە بەدەر لە بابەتی بردنەوە یان دۆڕان، نرخی ماسلۆڤ لە مێژووی تۆپی پێدا بە بەرزی دەمێنێتەوە.

لە هێزدا وەك شێر، لە خێراییدا وەك ئاسك، لە ڕەشاقەیشدا وەك پڵنگ، ڕاهێنەرە گەورەکە ئا بەم شێوەیە یاریزانەکانی دەویست، بیرۆکەکانیشی سەرچاوەی یەکەمی تەکتیکی نوێ بوون، بەدوور لە شێوازە تەقلیدی و یاریو وشك و دووبارەبووەکان. دواتر ناوی نوێ هاتە نێو ڕاگەیاندنەکانەوە، وەك : فشار، یاریساز، ئێرتیکازی بەرگری و پلانی (٤ – ٤ –٢) بە شێوەی سەردەمیانە.

سەرەڕای هەموو ئەوانەی ماسلۆڤ پێشکەشی کردووە، بەڵام خاڵێکی ڕەش لە مێژوویدا هەیە، بەتایبەتی بابەتی کێشەی کۆنی و نەگونجانی لەگەڵ ڤالێری لۆبانۆڤیسکی (١٩٣٩ – ٢٠٠٢)، لە کاروانی سەرکەوتنەکانی یەکێتی سۆڤیەتدا، هۆکاری ڕێك نەکەوتنی ئەم

دووانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی ڤالێری لە ژێر دەستی ڤیکتۆر لە دینامۆکییەف یاری دەکرد، نەگونجان و جیاوازی بەردەوامی هۆکار بوو بۆ ڕۆیشتنی یاریزانەکە بۆ تیپێکی تر، پێش ئەوەی ماڵئاوایی بکات و بڕیاری ڕۆیشتنە نێو کاری ڕاهێنەرایەتیکردن بدات.

ئەوەی نامۆیە لۆبانۆڤیسکی شێوازێکی پێچەوانەی ماسلۆڤی بەکارنەهێنا لە کاتی ڕاهێنەرایەتی کردندا، بەڵکو لایەنێکی دوژمنەکەی برد و گەشەی پێدا و جێدەستی تایبەتی خۆی بۆ زیاد کرد، بوو بە یەکێك لە گەورەترین ڕاهێنەرانی تۆپی پێ، لە کۆتا ڕۆژەکانیشیدا ددانی بەو ڕاستیە سەیرەدا، نا. دووپاتی کردەوە کە ڤیکتۆری ڕاهێنەر هەرگیز ڕازی نەدەبوو بە ڤالێری یاریزان، هەربۆیە ماسلۆڤ هاوشێوەی لۆبانۆڤیسکی نرخێکی گەورەی دەبێت، ئەو پیاوەی کە زانستی ئامارەکانی بۆ تۆپی پێ زیادکرد.

## دەیەم: بەرگریکردن هونەرە و ئیتاڵیەکانیش پادشایین

ووشـــەی کاتیناچـۆ تایبــەت کرابــوو بــە هــەر تیپێکــی شــێوە بەرگریکاریی لە جیهاندا، بەرگری کردن کارێکی باو بوو بـۆ هـەمووان، هیچ یاسا یان بنەمای جیاوازی نەبوو، تا وای لێ هات ئەوەی لە کاتی یاریەکاندا بەرگری بکات، ئەوا بە ئوسـلوبی کاتیناچـۆ یـاری دەکـات، لەگەڵ ئەوەی ئـەم کـارە تـەواو جیـاوازە لـە مـەرج و بنـەماکانی ئـەو شێوازەی جیهانی داگیر کرد لـە کۆنـدا، کـە بەهۆیـەوە چـەندین تیـپ سەرکەوتنیان بەدەست هێنا لە مێژووی جادوگەرە خڕەکەدا.

**کاتژمێری سویسری**




سەرەڕای ئەوەی لە وڵاتی هۆکۆ مایزڵە و سەر بـە قوتابخانـەی

تۆپی پێی دانووبیە، بەڵام کارڵ ڕاپان (١٩٠٥ – ١٩٩٦) بە ئاشکرا سەرسام بوو بە چاپمان، بەشێوەی زیادکردنی لەمسەی بەرگری بەهێزتر بۆ تەکتیکی هێرش بردن و زۆر توندوتۆڵکردنی لە هێڵی دواوە، ئەم پلانە بە (هەورە بروسکە) ناسرا یان (ڤیرۆ) کە زۆربەی تیپە سویسریەکان یاریان پێ دەکرد، بەهۆی ئەم پلانەوە هەڵبژاردەی وڵاتەکەی لە مۆندیالی ١٩٣٨ لە ئەڵمانیای بردەوە.

(ڤیرۆ) یەکەم هەنگاوی بونیاتنانی شێوازی بەرگری بوو، پاش ئەوەی ڕاپانی ڕاهێنەر هەستا بە کەمێك گۆڕانکاری لە شێوازی (WM)دا، لە بری سەرکەوتنی بەرگریکاری ئازاد بۆ پێشەوە، زیاتر دەگەڕایەوە دواوەی هەموان بۆ نزیك گۆڵچی، لەگەڵ هەوڵدانی پارێزگاری کردنی بوونی سێ یاریزان لە هەموو هێڵێك (بەرگری، ناوەڕاست، هێرش بردن)، هەربۆیە پلانەکە لە (٢ – ٣ – ٥)ەوە گۆڕدرا بۆ (١ – ٣ – ٣ – ٣)ی سویسری.

یاریکردن بەم دیواری بەرگریە بەرامبەر ئەو تیپانەی بە هێرشی بەردەوام یارییان دەکرد شتێکی جوان و سەرنجڕاکێش نەبوو، بەهۆی بوونی چەندین هێرشبەر لە بەرامبەر هێڵی بەرگری سویسری، وای لە تیپی ڕاپان کرد زۆر بگەڕێنەوە بۆ دواوە، کارەکە نزیك بوو لە سەرکێشی، لەگەڵ بوونی سیانەی هێرشبەری زۆر پێشکەوتوو، نیمچە جودا لە تەواوی هێڵەکانی تیپ، هەربۆیە ئەم بیرۆکەیە ماوەیەك سەرکەوتوو بوو بەڵام تا دەهات لێی پاشگەزدەبوونەوە لە بەرامبەر

شێوازی (٢ – ٣ – ٥)ی هێرشبەرانە.

میلانی ڕۆکۆ




لە (٥ – ٤ – ١)ی کارڵ ڕاپانەوە بۆ (٤ – ٣ – ٣)ی نیریۆ ڕۆکۆ (١٩١٢ – ١٩٧٩)، پلانی (٤ – ٣ – ٣)ی ڕۆکۆ پێک هاتبوو لە (١ – ٣ – ٢ – ١) بە بوونی سێ بەرگریکار لە دواوەیاندا، یاریزانی چوارەم هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی پڕکردنەوەی دواوە وەك لیبرۆیەکی تەواو، لەگەڵ یاری کردن بە سێ یاریزانی ناوەند کە تەواوی شوێنەکانی ناوەڕاست دادەخەن، پاشان هێرشبەرێکی تەواو و

دوو یاریزان لە لاکان وەك پالپشتیەك لە کاتی هێرشبردندا.

شێوازی یاری کردنی ڕۆکۆ لەگەل تریستینا و پاشان میلان، پشتی بەست بە ستراتیژیەتێکی بەرگری ناسراو بە (ڕاگوێزان)، واتا گەڕانەوەی یاریزانێکی هەر مەرکەزێك بۆ مەرکەزێکی نزیکتر لە بەرگری، لە هێلێکەوە بۆ هێلێکی تر بە مانای ئەوەی شێوازەکە (١ — ٣ — ٣ — ٣)یە بەلام دەبێت بە (١ — ٤ — ٣ — ٢)، واتا یاریزانێکی ناوەند دەگەڕێتەوە بۆ بەرگری بۆئەوەی چوار بەرگریکار لە دواوە هەبێت، پاشان یاریزانێك لە هێرش بردن دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاست، سیانەی ناوەند دووبارە دەبێتەوە و هێرش بردن تەنها لە دووانەیەك پێك دێت.

لە بەهێزترین حالەتەکانی بەرگریدا، یاریزانێکی تری هێرش بردن دەگەڕێتەوە بۆ لای سیانەی ناوەند و نەسەقی تەکتیکیەکە دەبێت بە (١ — ٤ — ٤ —١)، واتا بەرگریکارێك لە دواوە و هێرشبەرێك لە پێشەوە و لە نێوانیاندا هەشت یاریزان، هەربۆیە ڕۆسۆنێری بە بەهێزی ناوەڕاستی و داخستنی تەواوی لە بەرامبەر هەولەکانی هێرش بردنی تیپی بەرامبەر دەناسرایەوە، ئەگەر تۆپەکە تێپەڕ ببێت لەوێدا لیبرۆیەکی دواوە بوونی دەبێت بۆ پاراستنی زیاتر و زیاتر.

## ئینتەری هێریرا




وشەی لیبرۆ لە بنەڕەتدا ووشەیەکی ئیتاڵییە و مانای ئازاد دەگەیەنێت. لەبەرئەوەی ئەم شوێنە پەیوەست کرابوو بە یاریزانی ئازادی وابەستەنەکراو بە شوێنێکی دیاری کراو، سەرەتا لەگەڵ کارل ڕاپان کە دەستی کرد بە بەکارهێنانی یاریزانی دواکەوتوو لە شێوازی (١ – ٣ – ٣ – ٣)دا، پاش ئەمیش نێریۆ ڕۆکۆ لە گەڵ میلان بە تەکتیکی (١ – ٤ – ٣ – ٢)، لەو کاتەی هێریرا بوو بە ڕاهێنەری ئینتەر میلان، وردەوردە شێوازەکە پەرەی دەسەند، تا لە کۆتاییدا

خۆی بینیەوە لە شێوازی (٥ – ٤ – ١)، ناسراو بە پلانی ئینتەری هێرێرا.

ئینتەری هیلینۆ، پشتی بە پێنج یاریزان دەبەست وەك سووتەمەنی بۆ بەگەڕخستنی پێکهاتەکەی، پیچی بەرگریکار لە دواوەی دوو دڵی بەرگریکار وەك لیبرۆیەك بوو، دواین یاریزان لە هێڵی بەرگری ئەرکەکانی بەرگریکردنی زۆر پوختە، فاکێتی یاریزانی ناوەند بەرەو لای چەپ، کە دەرچوون دەکات بۆ هێرش بردن بەڵام وەك بەرگریکاری چوارەم دەگەڕێتەوە لە بەردەم لیبرۆ لە هێڵی بەرگریدا، هەروەها جایەر یاریزانی بەرەو لای ڕاست ئەرکەکانی لە نێوان بەرگری و هێرش بردن دایە وەك نیو تاك و نیو باڵ.

سوارێز و ماتزۆلا دوو یاریزانی ئەستێرە، یەکەمیان هێرێرا لە بەرشەلۆنە هێنای، لە کەتەلۆنیا وەك هێرشبەر یاری دەکرد، بەڵام لە ئیتالیادا بۆ یاریزانی ناوەڕاست گۆڕدرا، تۆپەکە وەردەگرێت و دەیداتە پێشەوە، سوارێز هاوشێوەی یاریزانی ڕیجیستای ئەم سەردەمە، لەبەرامبەردا ماتزۆلا یاریسازە یان فانتاسیستا، یاریزانی مەهاری و دریبکەرێکی باش و دروستکەری زۆربەی گۆڵەکانی تیپە بەهێزەکە بوو.

لە کاتی بەرگریکردندا، فاکێتی دەگەڕایەوە بۆ دواوە، لەوێ لیبرۆیەك و پاشان چوار بەرگریکار بوونی دەبێت، چوار یاریزانیش لە ناوەڕاست لە بەردەم هێڵی بەرگری و تاکە هێرشبەردا. کەمترین

بۆشایی و دەرفەت بۆ تیپی دژ دروست دەبوو، بەڵام لە حاڵەتی گۆڕین بۆ هێرشبردن، فاکێتی و جایەر لە لاکان دەردەچن، پیچی پاس دەدات بە سوارێز، ریجیستاکە بۆ ماتزۆلا، فانتاسیستاکە بۆ هێرشبەر، یاری درێژ و ڕاستەوخۆی تەواو بە کەمترین پاسدان.

ئینتەر لەگەڵ هێرێرا دوو پاڵەوانێتی چامپیۆنس لیگ و سێ پاڵەوانێتی سکۆدیتیۆ و پاڵەوانێتیەکی جامی بردەوە، ئەوە باشترین دەستکەوتی بەدەست هاتووی ڕاهێنەرە لە مێژووی یانە ئیتاڵییەکە، باشترین دیاری پێشکەش بە مۆراتی باوك كرد، كە هەرگیز بۆ تەنها جارێكیش پەشیمان نەبێتەوە لە پێدانی ئەو بڕە پارە خەیاڵیەی، كە بۆ مۆركردنی بۆند لەگەڵ ئەم ڕاهێنەرە خەرجی كرد.

## یازدەیەم : ئەرژەنتینا .. بوهەیمی تەکتیکی لە بەرامبەر توندوتیژی لاتینی

ئەگەر ڕۆژێك لـە ڕۆژان چـانس یـاوەرت بـوو، سـەردانی بـۆینس ئایرسی پایەتختی ئەرجەنتینت کرد، کاتێ کە تاکسیەك دەگریـت بـۆ ئـەوەی پیاسـەیەك بـە دەوری پاریـسی ئەمـەریکای لاتینـدا بکـەیت، شـۆفێرەکە دەستپێـشخەری دەکـات بـە پرسـیاری (ناسـنامەکەت، بیروباوەڕی سیاسییت، ڕێبـازی ئابووریـت، تیپـی پەسـەندکراوت لـەم شـارەدا)، لەگـەڵ پێـدانی کرێـی تەکسیەکە و نیـازت لـە دابەزینـدا، پرسیارە بەناوبانگەکەت لێ دەکات: ئایا تۆ لەگەڵ بیروڕای بیلارۆدیت یان مینۆتی؟ یان ئایا تـۆ لـە گـەڵ ڕابـەری قوتابخانـەی واقعیـت یـان بوهەیمیەی خەیاڵاوی؟

## پێنجیەکی سەرسوڕهێنەر




پێکهاتەی یانەی ریڤەر پلەیت لە پەنجاکانی سەدەی بیستەم، کە بە سەردەمی زێڕینی ئەم یانەیە دادەنرێت

"بەلای منەوە هەمیشە بڕوام وایە ئەم پێنج ئەستێرانە باشترینن بە درێژایی مێژووی تۆپی پێی ئەرجەنتیندا، مۆنیۆس و مۆرینۆ و پیدیرنیلا و لابرۆنا و لۆستاو". بەم شێوەیە ئەلفرێدۆ دی ستیڤانۆ (١٩٢٦ – ٢٠١٤) وەڵامی دایەوە کاتێك پرسیاری لێ کرا دەربارەی باشترین یاریزانەکان لە مێژووی تۆپی پێ دا. دی ستیڤانۆ تیشکی تەواوی خستە سەر ئەستێرەکانی ریڤەر پلەیت لە ڕۆژگاری زێڕینی خۆیدا، ئەو گروپەی جوانترین وێنەی یاری تۆپی پێیان لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا، پێشکەش دەکرد.

شێوازی یاریکردنیان بە (لاماکینا) ناسراوبوو، وەك هێمایەك بۆ

شـێواز یاریکردنیـان کـە وەکـو ژەنیـارێکی پرۆفیـشناڵ بـە جـوانترین شێوە ئامێرە میوزیکیەکە بژەنێت، یاریان دەکرد، ئـەم یاریـە یەکـەم کـاری هــەرەوەزی بـوو لــە نـاوخۆی ئەرژەنتینـدا، لەگـەڵ شـێوازی یــاریکردنی نزیــك لــــە (٢ – ٣ – ٥) لەگـــەڵ بنـــەماکانی تـــۆپی سەراپاگیریدا، بە بوونی یاریزانێکی ناوەڕاست کە توانـای گەڕانـەوەی بۆ دواوە هەبێت لە نێوان دووانـەی دڵـی بـەرگری و هاوتابێـت لەگـەڵ گەڕانەوەی یاریزانی تاکی ڕاست، شێوازەکە دەبێت بە نزیك لـە (٤ – ٣ – ٣)، فەزڵەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ جوڵانەوەکانی دۆستاو لە نێوان ناوەڕاست و هێرشبردندا.

لەگەڵ سـێ یـاریزانی جـوڵاو لـە تـەواوی سـێ یـەکی کۆتاییـدا، یـەکێك لـە گـەورەترین یاریـسازەکانی مێـژووی ئـەرژەنتین پاڵپـشتی دەکات، ئەویش مۆرینۆیە، ئەوەی کە مارەدۆنا دەربـارەی گوتویـەتی :"من زۆر شەرمەزارم بە باشترین یـاریزانی ئـەرژەنتینی هەڵبـژێردراوم کە یاری تۆپی پێی کردبێت، بۆ من شـەرمە پـێش مۆرینـۆی داهێنـەر ناوم هاتووە". بەهۆی زیرەکی و جوان یاریکردنی یانـەی ریڤـەر پلـەیت لەو سەردەمەدا، هەواداری تۆپی پێ لە سەرانسەری ئەرجەنتینـدا ڕووی لە زیادبوون کرد، بە جۆرێك لە گشت کوچە و کۆڵانێکی ئەم وڵاتـە یـاری تۆپی پێ دەکرا، لە گەڕەکە هەژار نشینەکان بەر لە گەڕەکە دەوڵەمەند نشینەکاندا.

## یەکەمجار بردنەوە

یانەی ستۆدیانتس لاپلاتا ئەو شێوازە جوان یاریکردنەی ریڤەرپلەیتیان  بە تەواوەتی سەراوگێر کرد، کاریان بەو پەندە ناوبانگە کرد "بەدەستی بهێنە پێش ئەوەی یاری بکەیت".
ستۆدیانتس یاری بازرگانی هەڵبژارد لە بری یاری جوان، ئەمەش بە (داخستنی تەواوی دەرچوونەکانی یاریگا، سەرنەکەوتن بۆ هێرش بردن، پشت بەستن بە هەڵەکانی ڕکابەر، گاڵتە پێ کردنی بۆ دوورخستنەوەی لە کەش و هەوای یاریەکەدا).

بۆ نموونە: گەر بهاتبا یاریزانێکی تیپی دژبەر بە ئۆتۆمبێلە بە بێ ئەنقەست لە کەسێکی بدایە، یاریزانانی ستۆدیانتس بە درێژایی یارییەکە سەریان لێ تێك دەدا و بە تاوانبار و بکوژ بانگیان دەکرد، یاخود ئەگەر منداڵی یاریزانێکی تیپی ڕکابەر نەخۆش کەوتبا، یاریزانانی ستۆدیانتس بە درێژایی نەوەد خولەکی یاریەکە ئەو ڕووداوەیان بیردەخستەوە.

ئەم تیپە توندوتیژە ژمارەیەك پاڵەوانێتی بەدەست هێنا، بەڵام وێنەیەکی ناشیرینی لەسەر تۆپی پێی ئەرژەنتینی بەجێ هێشت، بەتایبەتی لە جامە نێودەوڵەتیەکاندا کاتێك ڕوبەڕوی یانە ئەوروپیەکان دەبونەوە، زۆر بە توندی یاریان دەکرد، بە ئەنقەست ئازاری یاریزانانیان دەدا و دوچاری پێکانی درێژخایەن دەبوون، ئەمە

وای کرد کۆدەنگییەك لە ئەورووپا هەبێ کە چیتر لە بەرامبەریان یاری نەکەن، بەتایبەت پاش ئەو ڕوداوانەی بەرامبەر یانەی ئەی سی میلان ڕوویانـدا، کـە یاریزانـەکانی سـتۆدیانتس توندوتیژیـەکی زۆریـان لـە بەرامبـەر یاریزانـەکانی مـیلان ئەنجامـدا، بەشـێوەیەك ڕۆژنامـە ئەورووپییەکان ناسوی "ئاژەڵ"یان لە یاریزانانی ستۆدیانتس نا.

پـاش دۆڕانەکـەی بەرامبـەر فـاینۆرد لـە جـامی نێودەوڵەتیـدا، دەنگی نارەزایی ڕۆژنامەکانی ئەرژەنتین بەرزبوویەوە و داوایـان کـرد، شۆڕشێك بەسەر تـۆپی پێـی سـتۆدیانتس ئـەنجام بـدرێت، سـەرباری دروشمـەکانی وەك "بردنـەوە یەکـەمجار"، دۆڕانیـان بەرامبـەر ئەورووپییەکان پەلەی پێ کردن بە پێویستی سەر لـەنوێ گەڕانـەوە بـۆ جوانی و سیحری "لاماکینا"، سیزار لـویس مینـۆتی چارەسـەرکەر و فریادڕەسی ئەم دۆخە بوو.

**بوهەیمیەکی خەون بین**

"بـۆ ئەوانـەی کـە دەڵـێن تـەنها بردنـەوە گرنگـە، لـە سـی پاڵەوانێتی بەدەست هاتوو، پێویستە لەسـەرمان پرسـیار لـە خۆمـان بکـەین لەسـەر بیست و نـۆی و بڵـێین: چـیت بـەجێ هێشت بـۆ ئـەو یانەیەی کە کاری تێدا دەکەیت؟ چیت کردووە بۆ یاریزانەکانت؟ چیت بەچـی کـردووە لـە هەمبـەر ئەسـتێرەکانی هاوجیـل و سـەردەمەکەی خۆت؟ من لە پێناو بردنەوەدا یاری دەکەم، ئەو لـە پێنـاو بردنـەوەدا یاری دەکات، هەمووومان هەمان تێڕوانینمان هەیە، بـەڵام مـن هـەرگیز

جیاوازی ناکەم لە نێوان بردنـەوە و لایـەنی جـوانیی تێیـدا، هەمیشە ئەم دوو پرسیار لە خۆم دەکـەم: چۆن دەیبەیتـەوە، وە چـۆن یـاری دەکەیت لە پێناو بردنەوەدا"؟

ئەمە یەکەمین پەیامی سیزار لویس مینۆتی (١٩٣٨) بـوو پـاش گرتنە دەستی پۆستی بەڕێوەبـەری هونـەری هەڵبـژاردەی ئـەرژەنتین بەشێوەیەکی فەرمی، بە تـەواوەتی کۆتـایی هێنـا بـە شـێوازی یـاری کردنــی ســتۆدیانتس، چــیتر ســەردەمی هەوڵــدانی گەڕانــەوە بــۆ "لاماکینا" دەست پێ دەکاتەوە، لەگەڵ شێوازی یـاری کردنـی (٤ – ٣ – ٣) بە بـوونی چـوار بـەرگریکار، سـێ یـارزان لـە ناوەڕاسـت لـە نێویانــدا یــاریزانێکی ئێرتیکــازی بــەرگری تــەواو و یاریــسازێکی پێشکەوتوو، لەگەڵ سێ کوچکەی هێرش بـردن لـە پێـشەوەدا. ئـەوە شێوازێکە نزیکە لە شـێوازی یـاریکردنی ریڤـەر پلـەیت، بـەڵام لەگـەڵ بنەڕەتەکانی تۆپی پێی تازەدا، کە لەسەر هاوسەنگی نێـوان بـەرگری و هێرش بردن وەستاوە.

ئەرژەنتین مۆندیالی ١٩٧٨ی لەسەر دەستی مینۆتی، بەدەست هێنا. دوور لە هەندێ بۆچوونی تایبەت بە بوونی موئامەرە یان نا، لە کاتی بەڕیوەچوونی پاڵەوانێتیەکەدا. پاش بەڕیوەبردنی وڵات لە لایەن دیکتاتۆرێکی سەرسـەخت کـە بـە ئینقلابێکـی عەسـکەری دەسـەڵاتی گرتبووە دەست، بەڕاستی مینۆتی خۆی بە تەواوەتی بەدوورگرت لەو قسەو قسەلۆکانە، بەهۆی فەلسەفە تایبەتیەکـەی بـۆ تـۆپی پـێ، کـە

لەسەر جوانی و نایابی یاریکردن وەستاوە پێش بایەخدانێکی تایبەت بە بردنەوە یان دۆڕاندن.

هەربۆیە هیچ نامۆ نییە پاش وازهێنانی و تێپەڕبوونی چەندین ساڵ، ناسناوی " ئەو پیاوە باریکەی کە ئاراستەی تۆپی پێی ئەرژەنتینی گۆڕی" پێ ببەخشن، کە سەرەتا بە لێهاتوویی ریڤەر پلەیت دەستی پێ کرد، دواتر بۆ توند یاریکردنی ستۆدیانتس لاپلاتا، پاشانیش لەسەر دەستی مینۆتی گەڕانەوە بۆ (لاماکینا)، تا ئەو کاتەی بیلاردۆ مارەدۆنا دێن و تۆپی پێی ئەرژەنتینی دابەشی دوو بەرە دەکەن، بەرەی مینۆتی و بەرەی بیلاردۆ.

هەرەمی هەڵگەڕاوە




پێکهاتەی فینالی مۆندیالی ١٩٧٨: ئەرژەنتین ٢ – ١ هۆڵەندا، یاریگەی مۆنۆمێنتال، بوینس ئایرس، ٢٥ / ٦ / ١٩٧٨

## دوازدەیەم: تۆپی پێی سەراپاگیری دەرگای هۆڵەندا بە ڕووی جیهاندا

هەندێ جار، زانایەك زۆر بە ئاسانی بەرەو ڕووی داهێناندا دەڕوات، بەبێ هیچ ئاگاداركردنەوەیەكی پێش وەختە، هەندێكیان دێن و پوختەی كارەكانیان پێشكەش دەكەن، لە پێناو خزمەت كردنی مرۆڤایەتی بەبێ هیچ بەرامبەرێك. تۆپی پێ وەك ژیان وایە، وەك چۆن نیوتن لەگەڵ یاسای (كێش كردن)دا سەركەوت، لایبتس زانستی بەراوردكاری بیركاری دروست كرد، بەڕاستی هەریەكە لە ڕینۆس میچێلز (١٩٢٨ – ٢٠٠٥) و ڤالێری لۆبانۆڤسكی تۆپی پێیان بە تەواوی گەیاندە ئاستێكی تر، ئەمەیش پاش سەركەوتنیان لەسەر هێنانی شتی تازە و جیاواز، لەسەر مەوداكان و ڕۆڵی كاریگەر و بەرچاویان لە گەشەسەندنی تۆپی پێدا.

### یاریەكە ڕووبەڕووی بێزاربوون دەبێتەوە

پاش ساڵانی شەڕی جیهانگیری و نەهامەتییەكانی شەڕ، هۆڵەندایش وەك تەواوی وڵاتانی تری ئەوروپا، بەدەست كارەساتەكانی جەنگەوە دەینالآند، هەربۆیە ئەلبێرت كامۆ (١٩١٣ – ١٩٦٠) لەسەر ئەمستردام نووسیبووی: "ئەوپەڕی بێزاربوون لە هەموو شتێكدا، هەمان جگەرە و دوكەڵ، هەتاكو باران بە هەمان كەناڵەكان تێپەڕدەبن، بێ نوێگەریی". هەروەها تۆپی پێ لە هۆڵەندا بە دەست

گرانیی و ناڕەحەتیەوە بۆ ماوەیەکی درێژ دەینالاند، تەنها یاریەکی وەرگیراوە لە ئینگلتەرا، گەنجەکان هاوشێوەی ئینگلیزیەکان یاری دەکەن، هەربۆیە پێویست بوو کە کۆتایی بەم جۆرە یارییە بێزارکەر و بێتاموچێژە، بهێنرێت.

باوکی ڕۆحی تۆپی پێی هۆڵەندیی پیاوێکی ئینگلیزیە، ئەم زانیاریە دروستە و هیچ ڕایەکیتر هەڵناگرێت. جاك ڕینۆڵدز (١٨٨١ — ١٩٦٢) یاریزانی پێشووی یانە بەریتانیە ناسراوەکانی وەك مان سیتی و شیڤێڵد و چەند یانەیەکی تر، سەرکەوتنی گەورەی لە یاریگا وەك یاریزان بەدەست نەهێنا، هەربۆیە بڕیاری دا ڕوو بکاتە کاری ڕاهێنەرایەتی کردن، سەرەتا لەگەڵ یانەیەکی سویسری بەناوی سانت جالین دەستی پێ کرد، دوای هەڵبژاردنی لە لایەن جیمی هۆگان، بۆئەوەی ڕاهێنەرایەتی یانەکەی (ئەیاکس) بکات، جاك گەشتی بۆ هۆڵەندا کرد.

جاك ڕینۆڵدز سەرکەوتووبوو لە گواستنەوەی بیرۆکەکانی هۆگانی مامۆستا و سەرکردەی، لێرەوە هۆڵەندا بە یاریە جوانەکەیەوە دەناسرا، بە ئیعتیباری ئەوەی بە یەکێك لە پێشەنگەکانی تۆپی پێی دانووبی دادەنرێت کە بە کارامە و هێرشبردن و یاری کردن بۆ پێشەوە، جیادەکرێتەوە. پاش ئەمە ڕاهێنەرەکە پەیوەندی کرد بە هەڵبژاردەی هۆڵەنداوە، پاشان بۆ یانە ناوخۆییەکان، دووبارە گەڕایەوە بۆ قەڵای ئەمستردام لە سەرەتای

چلەکان بۆ ماوەیەك و پاشان نیوەی چلەکان، لێرە ڕینۆس میـچێڵزی یاریزانی لاو لە ژێر دەستی ئەمـدا فێردەبـوو، دواتـر دەسـتی کـرد بـە گواستنەوەی ئەزموونەکەی بۆ ناوچەیەکی بەربڵاوتر.

(٤ – ٣ – ٣)

شێوازی سەرەکی میچێڵز ئاوێتەی نێوان (٤ – ٣ – ٣) و (٣ – ٤ –٣)ە، چوار یاریزانی بەرگری بریتی یە لە دووانەی چەق و دووانەی تاکەکان، سێ یاریزانی ناوەنـد پێکهـاتوون لـە یـاریزانێکی ئێرتیکـازی تەواو و دوو یاریزانی تر، لەگەڵ سێ هێرش بەر، دووانیان لـە لاکـان و دانەکەی تر لە چـەق. لـە پێنـاو جێبـەجێکردنی ئـەم سـتراتیژیەتەدا، یاریزانانی ئەیاکس بۆ ماوەیەکی درێژ ڕاهێنانیـان ئـەنجام دەدا، تـاکو سەرکەوتن لە گەیشتن بە سـیناریۆیەکی گونجـاو، بـە فـشاری بـەرز و جوڵەی بەردەوام بەبێ وەستان.




کاتێك تیپی نەیار بە شێوازی بەرگری نزیك لە کاتیناچۆ یاری دەکات، ئەوا یاریزانی تاك کرۆڵی بەناوبانگ سەردەکەوێت بۆ پێشەوە و دەبێت بە یاریزانی باڵ، لە کاتێکدا باڵەکە دێتە ناو چەق وەك هێرشبەری دووەم و ژمارەی یاریزانانی پێشەوە دەبێت بە چوار، لە هەمان کاتدا یاریزانێك لە چەقی بەرگریەوە دەڕوات بۆ ناوەند و

دەبێت بە یاریزانی ئێرتیکاز. ئێرتیکازە ڕاستیەکە سەردەکەوێت بۆ پێشەوە، لێرەدا شێوازی (٤ – ٣ – ٣) نزیك دەبێت لە (٢ – ٤ – ٤) بە بوونی تەنها دووانەیەك لە دواوە، چوار لە ناوەڕاست، لەگەڵ سێ هێرشبەر و تاکێکی پێشکەوتوودا.

یاریزانە بەرازیلی و ئەرژەنتینیەکان لە ڕووی کارامەییەوە سەردەکەوتن بەسەر تەواوی ئەوروپادا، هەربۆیە ڕینۆس میچێلز و یۆهان کرۆیف (١٩٤٧ – ٢٠١٦)ی ئەستێرەی، ویستیان ئەو جیاوازیانەی نێوانیان کەم بکەنەوە، لە ڕێگەی پاسی وورد و پەستانی بەردەوام، لەگەڵ دەست گرتنە سەر مەوداکان بەپێی توانا، یۆهان دەڵێت: "هەموو شتێك تایبەتە بە مەودا، هەموو شتێك لە تۆپی پێ دا بە دەوری بۆشایی و مەوداکاندا دەخولێتەوە".

### ئەو بیرۆکانەی پێش سەردەمی خۆیان کەوتوون

تیپی هۆڵەندایی تەڵەی ئۆفسایدی زۆر زیرەکانە جێبەجێ دەکرد، پێش ئەوەی تیپی ڕکابەر پاس بدات، دواین بەرگریکار خێرا دەڕواتە پێشەوە، ( ٤ – ٥) یاریزان دەخرێتە ئۆفساید. میچێلز بیری نەکردەوە لە کوشتنی ڕکابەر تەنها بە شکست هێنانی هێرشەکانی، بەڵکو لە چۆنێتی ئۆفساید بکرێتە کارێك قابیلی هێرش بردن بێت، تەنها بە بەدەست هێنانی تۆپ، فەرمانی دەکردە سەر یاریزانانی خێرا بگەڕێنەوە دواوە، بۆئەوەی یاریگەکە فراوان بێت لە بەردەم هەلگری تۆپەکەدا، لەگەڵ بژاردەی زۆر بۆ پاسدان، لەبەرئەوەی

فەلسەفەی سەراپاگیری بە کورتی واتە : "یاریگە وەك ملی بوتڵ لێ بکە بۆ ڕکابەرەکەت، هەمان یاریگە وەك باخچەیەکی گەورە لێ بکە بۆ یاریزانەکانت، کارەکە سادە و ئاسانە، ئائەمەیە تۆپی پێ".

بەراوردی نێوان ڕینۆس میچێلز و ستیفان کۆڤاچ (١٩٢٠ – ١٩٩٥)ی جێگری لە ئەیاکس لە زیاد بووندایە، کۆڤاچ سەرکردایەتی ئەیاکسی کرد بۆ شکۆمەندی پاش ڕۆیشتنی ڕینۆس بۆ بەرشەلۆنە. ئەستێرەکانی ئەیاکسی حەفتاکان لە گوفتوگۆکانیاندا دووپاتیان کردەوە کە کۆڤاچ پیاوێکی گونجاو و ڕاهێنەرێکی زۆر زیرەك بووە، بەڵام میچێلز، گەورەترین پیشەگەر بووە لە دونیای هونەرەکاندا، لەبەرئەوەی ئەو بونیاتی دروستی بۆ ئەفسانەیی سەراپاگیری دانا.

کرۆڵی تاك دەردەچێت بۆ پێشەوە و دەگەڕێتەوە بۆ شوێنەکەی بێ سەرەڕۆیی، لەگەڵ پاشەکەوت کردنی ماندووبونێکی زۆر، لە بری بڕینی دە جاری یاریگە بە دووریەك بگاتە ١٤٠٠ مەتر، ئەو دووریەك دەبڕێت تەنها ١٠٠٠ مەتر بێت، ئەوەی ماوە یاریزانێکی هاوڕێی شوێنەکەی دادەپۆشێ، نهێنی ئەم بلیمەتیە هونەریە، توانایی یاریزانەکانە لە جێبەجێکردنی فشاری بەردەوام بۆ ماوەی شەش خولەکی تەواو، ژمارەیەکی زۆر نامۆ و تایبەتە بەنیسبەت یاساکانی تەکتیك، هەربۆیە "سەراپاگیریی" دڵی ملیۆنان کەسی داگیرکرد، بەڵام لەم ڕوویەوە تەنها نەبوو، لەبەر ئەوەی ڕاهێنەری دلان لە ئۆکرانیا گەشتەکەی دەست پێ دەکات، ڤالێری لۆبانۆڤیسکی چاوەڕێتان دەکات.

## سیازدەیەم: تۆپی پێ لە نێوان زانستی ئامارەکان و کەلەڕەقی ڕاهێنەردا

"ڤالێری لۆبانۆڤسکی" وەك یاریزان یەکەم خولی یەکێتی سۆڤیەتی بۆ دینامۆ کییەف لە ساڵی ١٩٦١ بەدەست هێنا، پاشان بە یاوەری هاوڕێکانی لە کاتی گەشتێکی تایبەتدا، چاویان بە پرۆفیسۆری بەناوبانگ ڤۆڵدیمار ساباڵدێز کەوت. هەموان لەسەر گرنگی بردنەوەکە قسەیان دەکرد، تا نۆرەی ڤالێری هات و گوتی :"بەڵی بردمانەوە، بەڵام دوایی چی؟ هەندێك جار خراپ یاری دەکەیت و بردنەوە بەدەست دەهێنیت، نەك لەبەر ئەوەی تۆ نایابیت، بەڵکو لەبەرئەوەی باشی نێو خراپەکانیت". ئەمە سەرەتای دروستبوونی نەوەیەکی ئامادەسازی تۆپی پێی سۆڤیەت بوو.

### بردنەوە ئامانج نییە

"بەڵێ سەرکەوتن گرنگە، بەڵام چی دەربارەی بڕی زیادکراو؟" ساباڵدێر یەکسەر وەلامی دایەوە: "چۆن ئاوها دەڵێیت لەسەر بردنەوەیەك کە هاندەرانی کییەف ساڵانێکە خەونی پێوە دەبینن"؟ ئەویش وتی: " خەونی ڕاستی ئەوەیە کە لەسەر یەك شت بوەستێت، کە لە بنەڕەتدا خەون بێت".

تۆ وەك زانایەك خەونت چی یە؟ بەدەستهێنانی پلەی دکتۆرا؟

مێژووی زانستیت؟ ئایا ئەمە خەونتە؟ زانا بە ئەزموونەکە تووشی سەرسوڕمان بوو، پێی گوت: "ڕەنگە"؟ بەڵام زانای ڕاستی ئەوەیە کە یارمەتی بەرەوپێشچوونی مرۆڤایەتی دەدات، جێ دەستی ڕاستی خۆی جێدەهێڵێت و ئەوانەی لە دوای ئەو دێن، سوودی لێ وەربگرن، ئەمەش وەڵامی منە". لۆبانۆڤسکی کۆتایی بە مشتومڕەکە هێنا. هەربۆیە هیچ نامۆ نییە کاتێك سەردانی ئۆکرانیا دەکەیت و ئامادەی یاریەکی دینامۆکییەف بیت، پەیکەری ڤالێری لە دەروازەی یاریگە گەورەکە دەبینیت. زۆرن ئەوانەی تەماشای تۆپی پێ دەکەن، بەڵام زۆر کەمن ئەوانەی کە دەی ناسن.

"تۆپی پێ سیتمێکە لە ٢٢ توخم پێك دێت، هەر سیستمێك ١١ توخم لەخۆ دەگرێت و ڕووبەڕوویی یەکتر دەبنەوە. لە کاتێکدا توانای هەردوو سیستمەکە یەکسان دەبێت، ئەنجامەکەی بە یەکسان بوون کۆتایی دێت. ئەگەر یەکێکیان زیادی کرد، بردنەوە یان دۆڕان دەردەکەوێت". ئا ئەمە گرنگترین تێگەیشتنەکانی ڤالێریە بۆ تۆپی پێ، ئەو ڕاهێنەرەی کە تەنیا بڕوای بە یاری بەکۆمەڵ هەبوو، سەرەڕای ئەوەی ئەو یاریزانێکی گەورە و باڵێکی مەهاری کاریگەر بوو، بەڵام هەموو ئەوانەی لە دەرەوەی هێڵ لەبیرکرد، بوو بە داهێنەری ئامارە یەکەمەکان لە تۆپی پێدا.

## ڕاهێنەر و زانا

لۆبانۆڤیسکی دۆستایەتیەکی هەبوو لەگەڵ ئەناتۆلی زیلینستۆڤی ئامارزانی ناودار، کارکردن لەسەر بیردۆزێك کە پێویستە یاریزان بزانێت لە کوێ و کەی پاس بدات، لەگەڵ ڕێژەی هێشتنەوە و کۆنترۆڵکردنی تۆپ، دیراسەکردنی هەموو جوڵە دیاریکراوەکانی هەر یاریزانێك لە ناوەوەی یاریگە و دەرەوەی یاریگە لە کاتی ڕاهێنانەکاندا.

ئەم دووانە بەرنامەیەکی ژمارەییان دانا بۆ شیکردنەوەی یاریەکان و دابەشکردنی یاریگەکە بۆ ٩ چوار گۆشە، پێوانەکردنی ژمارەی ئەو جارانەی کە هەر یاریزانێك لە کاتی یاریەکاندا بۆی دەچێت. دەستیان کرد بە تاقیکردنەوەی یاریزانەکان لەسەر: (کاردانەوەیان، توانای ئارامگرتنیان، هاوسەنگییان، تووڕەبوونیان، ... هتد)، بۆ هەر یەکێکیان نمرەیەکی دیاریکراو دادەنێن، لەم ڕێگەیەوە پێکهاتەی سەرەکی تیپەکە پێش هەر یاریەك دیاری دەکرێت.

ڤالێری دانی بەوەدا نا ئەو جیاوازییانەی لەگەڵ ماسلۆڤدا هەیبوو، بەتەواوەتی لەبیری کردوون، دووپاتی کردەوە ئەگەر ئەو جیاواز بێت لەگەڵ ڕاهێنەرە کۆنەکەی، جیاوازیەکە تەنها لە ئاستی تەکتیکی و تۆپی پێ دەبێت، ڤیکتۆر یاری لەسەر بەهرەکان دەکرد،

لە کاتێکدا لۆبانۆڤسکی بە تەنها بڕوای بە سەلماندن و بەڵگە هەبوو، یەکەم شت کە ڤالێری یاری لەسەر کرد، تەقالای ئەنجامدانی مەشق نوێی هەبێت لەبۆ قەدەغەکردنی ڕکابەر لە ڕاهاتن لەسەر پلانەکەی.

ئەگەر ڕکابەر لە شێوازی یاری کردنی دینامۆکییەف تێگەیشت، پێویستیان بە دۆزینەوەی ستراتیژیەتێکی تازەیە. ئا ئەمەیە مەنیتقی یاریەکە، پێویستە ڕکابەرەکەت ناچاربکەیت لەسەر شێوازی یاری کردنت نەك پێچەوانەکەی. هاوشێوەی میچێلز، ڤالێری دەی ویست بە فشاری بەرز تۆپەکەی دەست کەوێت، بەڵام ئەو تیشکی خستە سەر چۆنیەتی بەرگریکردن، لەبەرئەوەی بنەمای گەڕێدە سۆڤێتیەکە لە کۆتاییدا بریتی یە لە پەیوەست کردنی بەرگریکاران بە هێرشبردن، ڕاهێنانی هێرشبەران لەسەر ئەرکەکانی بەرگری. ئەمە جیهانگیری تۆپی پێ یە لە باڵاترین وێنەیدا.

## گشتگیری سۆڤیەتی




ئەگەر ڤیکتۆر ماسلۆڤ داهێنەری شێوازی یاری کردنی (٤ – ٤ – ٢) بێت، ئەوا ڤالێری لۆبانۆڤسکی یەکەمین ڕاهێنەرە کە هەڵدەستێت بە پێشخستنی ئەم پلانە، ئەمەش لەگەڵ تیپی دینامۆکییەف و هەڵبژاردەی یەکێتی سۆڤیەتدا، کاتێ ئەوەی زێڕینی هەشتاکانی سۆڤیەت توانی کێبڕکێی هەموو پاڵەوانێتیەکان بکات، چی لەسەر ئاستی یانەکان یاخود لەسەر ئاستی هەڵبژاردەکاندا. بە فشاری بەرز و هەوڵدان بۆ کوشتنی ڕکابەر لە ناوچەکەی خۆی، بە بەدەست هێنانی تۆپ و ئەنجام دانی هێرشی پێچەوانەی کوشندە.

هەمووی بە شێوازێکی ڕێکخراو یاری دەکات، هیچ کەسێکی لە

سەرووی تیپەکەوە نییە، تەواوی تیپەکە پێکەوە بەرگری دەکەن و هێرش دەبەن بە دایناماکیەتێکی سەرسوڕهێنەر، وەك ئەوەی لۆبانۆڤسکی هەستا بێت بە گۆڕینی ئەو یاریزانانە بۆ کۆمەڵە ئامێرێك، کە وەستان و ماندووبوون نەزانن. شێوازی ڤالێری وەك یەکەمین کرۆکی شێوازی فشاری هەڵگەڕاوەی ناسراو بە ( Counter Pressing) دادەنرێت، واتە بەرتەسك کردنەوەی مەوداکان و خنکاندنی ڕکابەر بە فشارخستنە سەری لە ناوەندی یاریگە و پاشان ڕفاندنی تۆپەکە.

تۆپی پێ تەنها بە قاچ ئەنجام نادرێت، بەڵکو بە ئەقڵیش ئەنجام دەدرێت، هەربۆیە هەموان بەشداری کارە تەکتیکیە زانستیەکەیان دەکرد لە پێش و پاشی یاریەکاندا. زیلینیستۆڤ پسپۆڕی ئامادەکردنی یاریزانەکان بوو، یاریدەدەری دووەم بۆ کۆکردنەوەی زانیاری تایبەت دەربارەی ڕکابەرەکە، یاریدەدەری سێ یەم بۆ یارمەتیدان لە ڕاهێنانەکاندا. تیپێکی تەواو و پسپۆڕ و لێزان زانستیان هێنایە ناو دونیای تۆپی پێ.

## چواردەیەم: بەرازیل و ئیتاڵیا لەسەر ڕێچکەی ئەمەریکا و سۆڤیەت!

بەڕاستی جامی جیهانی (١٩٧٠)ی مەکسیك ئەفسوناوی بوو، مۆندیالەکە خۆی وەك (فیستیڤاڵی تۆپی پێی هێرشبردن) نمایش کرد. هەڵبژاردەی بەرازیل کە جامی جیهانی بەدەست هێنا، خاوەنی کۆمەڵێك ئەستێرەی بەناوبانگی وەك: (پیلێ، تۆستاو، جێرسۆن، ڕیڤیلینیۆ، ... هتد) بوو. بردنەوەی بەرازیل لە ئیتاڵیا هاوتابوو لەگەڵ سەرکەوتنی ئەمەریکیەکان بەسەر سۆڤێتیەکاندا لە شەڕی بۆشایی ئاسماندا، بەجۆرێك ڕۆژنامە مەکسیکیەکان ناوی بردنەوە گەورەکەی بەرازیلیان نا "کرداری سەرکەوتن بۆ سەر مانگ، لەسەر شێوازی ناسای ئەمەریکی".

## بەرازیلی ١٩٧٠

ئاشقانی تۆپی پێ تیپی بەرازیلی ١٩٧٠ بە یەکێك لە باشترین هەڵبژاردەکانی جامی جیهانی پێناسە دەکەن، ئەگەر باشترینیان نەبێت، بەهۆی تۆپی پێی هێرشبردنی نایاب و لێوانلێو بە مەهارەی سەرسوڕهێنەر. ڕێگای سیلیساو لە بەدەست هێنانی ناسناوەکە زۆر نایاب بوو، گریێ کوێرەی پیرۆی تێپەڕاند لە قۆناغی هەشت، تۆڵەسەندنەوە لە ئۆرۆگوای لە نیوەی کۆتایی، لەگەڵ گۆڵباران

کردنی ئیتاڵیەکان بە چوار گۆڵ لە یاری کۆتاییدا، بیٚ هیچ ڕکابەرییەك شایەنی باسکردن بێت.

تیپی ماریۆ زاگالۆ (١٩٣١)ی ڕاهێنەر، توانیان باشترین شێوازی یاریکردنی (٤ — ٢ — ٤) پێشکەش بکەن، کە لە زۆربەی کاتەکاندا دەبێت بە (٤ — ٢ — ٢ — ٢)، بە ئامادەبوونی دووانەکان لە هەموو هێڵێکی ناو یاریگەدا. سەرەتا لە گەڵ تۆستاوی هێرشبەر و پیلێی گەوهەرە ڕەشەکە، تۆستاو هێرشبەرێکی تەواو نییە، بەڵکو یاریزانێکی فرەجوڵەیە، کەمێك دەگەڕێتە دواوە و پیلێ دەڕواتە شوێنەکەی، لەگەڵ ڕیڤیلینیۆی مەهاریی و داهێنەر، توانای تۆمارکردنی گۆڵی هەیە لە هەر شوێنێکی ناو یاریگەدا.

بلیمەتی پلانەکە لە هێرشبردن نەبوو، بەڵکو لە چۆنێتی پڕکردنەوەی زۆرترین مەودا بەپێی توانا بوو، لە ڕێگەی سەرکەوتنی یەکەم یاریزانی تاکی ئازاد لە مێژووی یاریەکە (کارلۆس ئەلبێرتۆ پێرێرا)، ئەو ئەستێرەی بەردەوام دەجوڵێت لە ئەوپەڕی ڕاستەوە بۆ ناو هێڵی سزا، سەرەڕای ئەوەی ئەولە بنچینەدا تەنها یاریزانێکی بەرگرییە، نهێنیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ زیرەکی جێرزینهۆ، جێگرەوەی گارینشیای باڵندە، کە شوێنەکەی خۆی لەسەر هێڵ جێدەهێڵێت و خێرا دەڕواتە شوێنەکەی بۆ ئەوەی بوار بدات بە کارۆلۆس ئەلبێرتۆ پێرێرا بۆ پێشەوە سەربکەوێت.

## فیناڵی مەکسیك

فینـاڵی مەکـسیکی ١٩٧٠ ڕووبـاڵێکی ڕاگەیانـدنی بـێ وێنـەی بەخۆیەوە بینی، یاریەك لە نێوان تیپێك یـاری تـۆپی پـێ دەکـات بـە جۆش و خرۆش و تیپەکەی تر لایەنی بەرگری زۆر بە باشی دەزانێت، بـە پـشتبەستن بـە گیـانی هیلینـۆ هێرێـرا و تـەکتیکی کاتیناچـۆی سەرکەوتوو لە شەستەکان لەگەڵ زۆربەی تیپە ئیتاڵیەکاندا. هەربۆیـە پاش سەرکەوتنەکەی بەرازیل، ڕۆژنامـە لاتینیـەکان بـە ناونیـشانێکی یەکگرتوو دەرچوون : هونەر لە پارێزگاری بەرگریکردنی بردەوە !

ئیتاڵیـەکان بـە یـەك لیـبرۆ لـە دواوە یاریـان دەکـرد، لەگـەڵ چاودێری کردنی یەك – بۆ – یەکی پەکخراو لەسەر هەموو کلیلەکانی ڕکابەرەکانیاندا، هەموان پێشبینی یاریـەکی داخراویـان لـە نێوانیانـدا دەکرد، بەڵام بەرازیل بە لامەرکەزیەتی پلانـی بردیـەوە، بەشـێوەیەك هەموان دەیان پرسی: ئایا زاگالۆ بە پلانی (٤ – ٢ – ٤) یـان (٤ – ٣ – ٣) یان (٤ – ٤ – ٢) یاری دەکـات؟ هـەموو ئـەم پلانانـە و زیـاتر، پاڵـەوانی جیهان،یـاری پـێ دەکـرد. دواتـر ئازۆریـەکان بەتـەواوەتی شکستیان هێنا لە چاودێری کردنی یاریزانـانی بـەرازیل، لەبەرئـەوەی هێرشبەر دەگەڕایەوە بۆ ناوەڕاست، یاریزانی ناوەنـد زۆر بـە ئاسـانی بە ئاراستەی گۆڵەکە دەجولا، بەردەوام بەم شێوە ...

مەکسیك بـۆ ئەوروپیـەکان هاوشـێوەی مانگـە، ژینگەیـەکی سەخت و کەش و هەوایـەکی نـامۆ کـە بـە ئاسـانی توانـای ڕاهاتنیـان نییە، هەربۆیە هەڵبژاردەکانی کیشوەرە پیرەکـە، هەوڵیانـدا بـەڕووی زەبەلاحەکانی ئەمەریکای لاتینی بوەستن، بەڵام سـەرکەوتوو نـەبوون لــە داخــستنی تــەواوی بۆشــاییەکان لەبەرامبــەر خــاوەن بــەهرە تایبەتەکاندا، سیلیساو بردیەوە و کۆتایی هاتنی (کاتیناچیۆی ئتاڵی) نووسیەوە.




پێکهاتەی فینالی مۆندیالی ١٩٧٠: بەرازیل ٤ – ١ ئیتالیا، یاریگـەی ئـازتیکۆ، مەکسیکۆ سیتی، ٢١ / ٦ / ١٩٧٠

## زۆنا میستا

بەرازیلی ١٩٨٢ باشترین هەڵبژاردەیە یاری تۆپی پێی کردبێت و ناسناوەکەی بەدەست نەهێنابێت، هاوشێوەی هەڵبژاردەی هەنگاریای ١٩٥٤. لە میانەی یاریەکانی قۆناغی یەکەمی مۆندیالدا، سێ یاریان بردەوە بەبێ ماندووبوونێکی ئەوتۆ، پاش تێپەڕاندنی گرێ کوێرەی ئەرژەنتین لە قۆتاغی دووەمدا، هەموان پێشبینی بردنەوەی پاڵەوانێتیەکەیان لێ دەکرد، تەنیا پێویستی بە یەکسان بوون هەبوو لە بەرامبەر ئیتاڵیادا، بەڵام ئازۆری لە دوورەوە گەڕایەوە و بە تەواوی کۆتایی هێنا بە تەکتیکی (٤ – ٢ – ٢ – ٢)ی بەرازیلی، بە ئامادەبوونی گەورەکانی وەك: "سوقرات، ڤالکاو، سیریزۆ، زیکۆی بلیمەت" لە ڕیزی هەڵبژاردەی بەرازیلدا.

هەرەمی هەڵگەڕاوە




پێکهاتەی قۆناغی دووەمی مۆندیالی ١٩٨٢، ئیتاڵیا ٣ – ٢ بەرازیل، یاریگەی ساریا، بەرشەلۆنە، ٥ / ٧ / ١٩٨٢

"ئەوە ئەو ڕۆژە بوو کە تۆپی پێ تێیدا مرد" زیکۆ بەم شێوەیە داخی دڵی خۆی دەربڕی پاش دۆڕانیان بەرامبەر ئازۆری، لەم یاریەدا ئیتاڵیەکان دەستیان هەڵگرد لە کلاسیکیەتی کاتیناچۆ، پشتیان بەست بە بیرۆکەیەکی بەرگری تر ناسراو بە "زۆنا مێستا"، کە مەبەست لێی ئاوێتەی نێوان چاودێری یەك – بۆ – یەکی و

چاودێری شوێن. لەگەڵ دانانی تەرکیزی تایبەتی لەسەر زیکۆ لە لایەن جێنتلی بەرگریکارەوە، ئەو سەربڕەی کە بە تەواوەتی کۆتایی هێنا بە مەترسیەکانی مارەدۆنا لە هەمان مۆندیالدا.

پاش ساڵێك لەم فینالەدا، یۆڤێنتوس کە زۆربەی یاریزانەکانی پاڵەوانی مۆندیالی ١٩٨٢ بوون، لە بەرامبەر هامبۆرگ بە سەرکردایەتی ڕاهێنەری ئەفسانەیی ئێرنست هاپل (١٩٢٥ – ١٩٩٢) یاری کرد. تیپە ئیتاڵیەکە بە هەمان شێوازە تایبەتەکە بە چاودێری یەك – بۆ – یەکی توند لەسەر چەکەکانی نەیارەکەی یاری دەکرد، بەڵام هاپل زووتر لە پلانەکە تێگەیشتبوو، باستۆربی ئەستێرەی خستە لای چەپ، تاکو کلاودیۆ جێنتلی ناچار بکات شوێنەکەی جێ بهێڵێت و بێت بۆ لای چەپ، لە پێناو یارمەتیدانی کابرینی لە لاکاندا، تاردێلی بە تەنیا مایەوە لە لای ڕاست و ماگاس لێی دەرباز دەبێت و تاکە گۆڵی یاریەکە تۆماردەکات.

## هەرەمی هەڵگەڕاوە




پێکهاتـەی فینـاڵی چامپیۆنس لـیگ، وەرزی ١٩٨٢ – ١٩٨٣: شـاڵکە ١– ٠ یوفێنتوس، یاریگەی ئۆلەمپیکۆ، ئەسینا، ١٩٨٣/٥/٢٣

## پازدەیەم: دییەگۆ مارەدۆنا لە کۆتاییدا هەرەمەکە هەڵدەگەڕێنێتەوە!

تۆپی پێ بژاردەیە، یارییەکە بنەمای تایبەتی خۆی هەیە، هەر کەسە و ئەو ڕێگایەی دەیەوێت هەڵی دەبژێرێت، بە هێرشبردن یان بەرگری کردن، دەست پێشخەری یان کاردانەوە، دەرچوون بۆ پێشەوە یان وەستان لە دواوە، تۆپی چەپەکان کە خۆی لە سیزار مینۆتی دەبینێتەوە، یان ڕاست ڕەوی ئوصولی کارلۆس بیلاردۆ و شوێنکەوتوانی؟ سەرەڕای ئەوەی هەڵبژاردەی بیلاردۆ لەگەڵ مارەدۆنای ئەفسانە مۆندیالی ١٩٨٦یان بەدەست هێنا، بەڵام ئەم تیپە زیاتر لە جۆری تۆپی پێی واقیعی هەژمار دەکرێت، بە بیرۆکەی دژی گشتگیری هوڵەندی دادەنرێت، نهێنیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ پاشای ژمارە ١٠، دییەگۆ.

### مەسەلەی بیروباوەڕ

پاش ئەوەی کارلۆس بیلاردۆ کاری ڕاهێنەرایەتی هەڵبژاردەی ئەرژەنتینی لە شوێنی سیزار مینۆتی لە ساڵی ١٩٨٢ گرتە دەست، هەردووکیان لە چاوپێکەوتنێکی خێرا ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە، مینۆتی ڕەخنەی توندی لە شێوازی یاریکردنی ستۆدیانتس گرت، ئەو یانەیەی کە بیلاردۆ وەك یاریزان یاری بۆ کردووە و ڕاهێنەریشی کردووە، بوهەیمیەکە تیپەکەی بیلاردۆی بە هۆکاری سەرەکی

دواکەوتنی تۆپی پێی ئەرژەنتینی بۆ چەند ساڵێك وەسف كرد، بە شێوەیەك شێوازی یاریکردنیان وای لە زۆر بەی تیپەکانی جیهان کرد کە خۆیان بەدووربگرن لە ڕووبەڕووبوونەوەی سەماکارەکانی تانگۆدا، وەك ئەوەی سیزار نامەیەکی لەسەرخۆ ئاراستەی کارلۆس بکات و پێی بڵێت: "پێویستە دووربکەویتەوە لە ستۆدیانتس، پارێزگاری بکەیت لە نەهجی ئێستای هێرشبردندا".

بیلاردۆ، سەرەڕای ئەمە، ئامۆژگاری پێشینەکەی پشت گوێ خست و ئەلبێرتۆ تارانتینی و هۆگانی لە پێکهاتەی فەرمی یەکەم یاری تیپەکەی سڕیەوە، هەوڵیدا سیستمێکی تەکتیکی تەواو جیاواز لە شێوازی یاریکردنی مینۆتی دروست بکات، لەگەڵ لێدوانە بەناوبانگەکەی پێش گرەوکردنی لەسەر واقیعیەت: "دەمەوێت یەکەم بم، ژمارە یەك، هەردەم و هەمیشە براوەبم، پلەی دووەم بەلای منەوە شکستە، هەتاکو بەشێوەیەکی جوان و جیاواز یاری بکەم، تۆپی پێ لە بنەڕەتدا یاریەکە لەسەر بەدەست هێنانی بردنەوە دامەزراوە، تەنها بردنەوە و هیچی تر، هەربۆیە ئەوەی چێژی دەوێت، پێویستە بڕوات بۆ سینەما یان شانۆ، هەتاکو بە سەربەستی چێژ وەربگرن، بەڵام لەنێو یاریگەدا، ئەم جۆرە ئامۆژگاریانە ناخەینە ناو پلانەکانمان". ئەمە سەرەتای شەڕەکەی نێوانیان بوو.

## هەڵگەڕانەوەی هەرەم

درەوشـــانەوەی ئەســـتێرەکانی وەك پلاتـــینی و مارەدۆنـــا، ڕاهێنەرانی ناچارکرد دەستکاری پلانەکانیان بکەن، لە ڕووی لۆژیکی "ئـەنجام پاسـاوی هۆکـار دەداتـەوە"، هەربۆیـە کـارلۆس بـیلاردۆی ڕاهێنـەر بیرۆکەیـەکی بـۆ هـات، بـە یـاری کـردن بـە سـێ یـاریزان لـە بەرگری، پێنج یاریزان لە ناوەڕاست، دوو یـاریزانیش لـە هێرشـبردن. ڕۆژنامەکان لەو کاتەدا هێرشیان کردە سەری، بەڵام ئەو گوتی (من لە سەر هەقم و ئەستەمە بە یەك هێرشبەر بەرامبـەر ئەورووپیـەکان یـاری بکەین، بە بوونی یاریزانێکی زیاتر لە ناوەڕاست ئـازادی تـەواو دەدات بە دییەگۆ ئارماندۆ مارەدۆنا لە هێرشـبردندا). پلانـی (٤ — ٣ — ١ — ٢) گۆڕدرا بۆ پلانی (٣ — ٥ — ٢) یان (٣ — ٥ — ١ — ١).

سـەرەتاکانی تـەکتیکی تـۆپی پـێ لەگـەڵ تـەکتیکی هـەرەمی بـــەناوبانگ (٢ — ٣ — ٥) بـــوو، مارەدۆنـــا و هاوڕێکـــانی توانیـــان هەڕەمەکـە ئـاوەژوو بکـەن بـۆ (٥—٣—٢) بـە گەڕانـەوەی هـەردوو یاریزانەکـەی تـاکی بـەرگری بـۆ دواوە لـە کـاتی بەرگریکردنـدا، بـە ژمارەیەکی زۆر یاریزان ڕێگای گەیشتنیان بۆ گۆڵەکـەیان دادەخست، لەگەڵ بوونی سێ یاریزان لە یـەك کاتـدا لـە دواوەی دییـەگۆ، ئـا بـەم شـێوەیە ئـەم تەکتیکـە بـوو بـە نـاودارترین تـەکتیك لـە مۆنـدیالی (١٩٨٦)دا.

لە پاڵەوانێتیەکەدا مارەدۆنا وەك هێرشبەرێکی دواکەوتوو یاری دەکرد، نەك وەکو یاریسازێکی تەواو، لەگەڵ هێڵی ناوەڕاستی تۆکمە و جۆراوجۆر، باتێستا تۆپ بڕە، جۆلیۆ یان ئینریکی یاریزانی ناوەندی یارمەتیدەری بەرەولای لاکان، لەگەڵ بروچاگای یاریزانی ناوەندی خێرا، کە دەردەچێت بۆ هێرش بردن، لەگەڵ ڤالدانۆی هێرشبەری نزیك لە مارەدۆنا، لە دواوە سێ یاریزانی تەواو، لیبرۆیەك و دوو یاریزان بۆ چاودێری، لەگەڵ گەڕانەوەی دوو یاریزانەکەی تاکی بەرگری، کە هەردەم لە نێوان هێڵی (بەرگریکردن – هێرشبردن) لە جوڵەدا بوون.




فینالی مۆندیالی ١٩٨٦: ئەرژەنتین ٣ – ٢ ئەڵمانیای خۆرئاوا، ئازتیکا، مەکسیکۆ سیتی، ٢٩ / ٦ / ١٩٨٦

## دەسەڵاتی سیانەی دواوە

پاش مۆندیالی ١٩٨٦ شێوازی یاری کردنی (٣ – ٥ – ٢) لە سەرجەم یاریگاکانی جیهاندا بە خێرایی بڵاوبوویەوە، بوونی ئەستێرەیەکی بەنرخی وەك پلاتینی لە پێکهاتەی فەرەنسادا، هەڵبژاردەی کەڵەشێرەکانی ناچارکرد بە یەك لیبرۆی دواکەوتوو و سێ یاریزانی تەواو لە ناوەڕاست یاری بکەن، لە پێناو پێدانی ئازادی جوڵەکردن بۆ میشێلی ئەستێرە. هەروەها هەڵبژاردەی ئەڵمانیا بە هەمان پلان بۆ چەندین ساڵ یاری دەکرد، لەگەڵ سەرکەوتنی لیبرۆ بۆ هێرش بردن بە بەردەوامی، لە پلانێکی نزیك لە (١ – ٣ – ٣ – ٣)، لەگەڵ بوونی سێ یاریزان لە هەر هێڵێکدا، لەگەڵ یاریزانی گسکدەر (قشاش – Sweeper) کۆتایی.

تەنانەت هەڵبژاردەی بەرازیلیش دەربازی نەبوو لەم پلانە، (٤ – ٢ – ٤)ی بەرازیلی هەڵگەڕایەوە بۆ هاوشێوەی (٥ – ٣ – ٢) بە گەڕانەوەی یاریزانێك لە ناوەڕاستەوە بۆ دواوە، دەبوو بە بەرگریکاری سێ یەم لە پێکهاتەکەدا، لەگەڵ دەست هەڵگرتن لە یاریزانێکی هێرشبەر لە پێناو بەهێزکردنی هێڵی ناوەڕاست. گۆڵ تۆمارکردن لەو دەمەدا کەم بوویەوە، ڕێژەی (٢،١٢) بۆ هەر یاریەك، لەگەڵ بەرزبوونەوەیەکی بەرچاوی ژمارەی کارتە سوورەکان، بەهۆی ڕوبەڕووبوونەوەی سەخت و زۆر لە ناوچەی ناوەڕاستدا.

ئەم پلانە بەردەوام لە بڵاوبوونەوەدا بوو، تا هاتنی دوو ڕوداوی زۆر گرنگ، پاڵەوانێتی ئەوروپای ١٩٨٨ لەگەڵ دوو تیپەکەی فینـاڵ، یەکێتی سۆڤیەت بـە شـێوازی (٤ — ٤ — ٢)ی ڤـالێری لۆبانۆڤـسکی، هۆڵەندا لەگەڵ شێوازی (٤ — ٤ — ١ — ١) بە ئامادەبوونی گۆلێـت لە دواوەی ڤان باستن لەژێر دەستی ڕینۆس میچێلز. پاش ئەمە کوڕی پێلاوفرۆشەکە تۆپی پێی خستە ئاستێکی تەکتیکی جیـاواز، ئـەریگۆ ساکی، کە دواتر قسەی تایبەتی خۆی دەبێت.

## شازدەیەم: بێڵ شانکلی و هاوڕێکانی ... لەپێناو تۆپێدا درووستکراون!

"بەڕاستی باشترین ڕاهێنەر بووم، پێویست بوو لەسەرم بردنەوەی زیاتر بەدەست بهێنم لەوەی بەدەستم هێناوە، هیچ شتێکی ئابڕووبڕێنم ئەنجام نەداوە، بە دڕندەیی یاری دەکەم و قاچی ژنەکەم دەشکێنم ئەگەر لە دژی یاری بکەم، بەڵام هەرگیز خیانەتم لێنەدەکرد"! بەم شێوەیە بێڵ شانکلی (١٩١٣ – ١٩٨١) بە هەموو سەربەرزی و شانازیەکەوە باسی کاروانی ڕاهێنەرایەتی خۆی دەکات، ئەو ئەو پیاوەیە کە لە پێناو لیڤەرپول دروست کراوە، هەروەك خۆی حەزدەکات باسی بکەین. دوور لە کارەکتەری خۆشەویستی بۆ تۆپی پێ، بەڕاستی بێڵ شانکڵی و هاوڕێکانی هیچیان کەم نییە لە ئاڵف ڕامسی، پاڵەوانی مۆندیالی ١٩٦٦ لەگەڵ ئینگلتەرا، پراگماتیکی ئینگلیزی، لە ئەوەوە و بۆ ئەو دەگەڕێتەوە.

### لیڤەرپوولی ئەورووپا

بێڵ شانکڵی شەیدای تەکتیك نەبوو، زۆربەی کارە پلانیەکانی دەدا بە بۆب بایزلی (١٩١٩ – ١٩٩٦) یاریدەدەری، ئەو ڕاهێنەرەی پاش شانکلی، کە زیاد لە بۆنەیەك سەرکردایەتی لیڤەرپولی کرد بۆ سەربەرزیی ئەورووپی. شانکلی دەڵێت: کاتێك ئەو کاری ڕاهێنەرایەتی

گـەورەی مێرسیـسایدی گرتـە دەسـت، لەبەرچـاوی خـۆی ئـەو یـاری کردنەی دانا کە ئینگلیز و گەلی بەریتانی خۆشیان دەوێت، نهێنی لـە پێـشکەشکردنی نمونەیـەکی تـەکتیکی نوێـدا نییـە، بـەڵکو هەوڵـدانی گەیـشتن بـە شـێوازێکی کاریگـەر کـە نـەیار بکوژێـت. بەمـە ڕیـدزی گەیانـدە سـەر تـەختی ناسـناوەکان، شـانکلی و ئەوانـەی پـاش ئـەم یاریەکـەیان لەسـەر ڕێـچکەی زۆربـەی ڕاهێنـەرە ئینگلیزیـە کۆنـەکان بەڕێوە برد، بردنەوەیان لەسەر شێوازی بەریتانیەکان بوو.

"گوتیان زۆر ئاسانە پێشبینی کردنی شـێوازی یـاری کردنمـان، بەڵام بڕوام وایە هەر تیپێك پێشبینی شێوازی یـاری کردنـی نـەکرێت، ئەوا کاتی بەفیڕۆ داوە. شێوازی یاری کردنی جۆی لویس ناسـراوبوو، کەچی هەر پیاوێکی دەدا بە زەویدا کاری تـەواودەبوو! بەڕاسـتی زۆر ئاسان بوو پێشبینی کردنی شێوازی یاری کردنمان، بەڵام تیپی نـەیار دەستەپاچەدەبوو لە وەستاندنماندا".

پلانـی (٤ – ٤ – ٢)ی لیڤـەرپول، چـوار یـاریزان پاشـان چـوار یاریزان پاشان دوو یاریزانی پێشکەوتوو، لەگەڵ شـێوازی یاریکردنێـك ، کە پشت دەبەستێت بە پاس دان و شـکاندنی تیـژی تیپـی ڕکابـەر، پێچەوانەی زۆربەی تیپەکانی ئینگلتەرا کە ئەو کاتە تەنها پشتیان بە تۆپـە بـەرز و درێـژەکان دەبەسـت، هەربۆیـە لیڤـەرپوول کۆپیـەکی جیاواز لـە وێنـە باوەکـەی پێـشکەش کـرد، سـەرکەوتن لـە بەزانـدنی ئاسمـانی ئەورووپیەکانـدا، لـە ڕێگـەی بردنـەوەی چـەندین پاڵـەوانێتی

بەنرخ.




پێکهاتەی فیناڵی چامپیۆنزلیگ، وەرزی ١٩٧٦ – ١٩٧٧: لیڤەرپوول ٢ – ١ بروسیا مونشن گلادباخ، ئۆڵەمپیکۆ، ڕۆما، ٢٥ / ٥ / ١٩٧٧

## پێشڕەوی کردن لە دوواوە

تیپی واتفۆرد بە درێژایی حەفتاکان و هەشتاکاندا، تۆپی پێی نەترس و ئازای پێشکەش دەکرد، هەرچەندە ئەم تیپە ناسناوی خولی ئینگلیزی بەدەست نەهێنا، بەلام ئەزموونێکی کەمێك نامۆی پێشکەش کرد، بە سەرکەوتنی لە خولی پلە چوارەوە بۆ خولی پلە دوو لە چەند سالێکی کەمدا، پاشان سەرکەوتنی بۆ خولی پلە یەك و بەدەست هێنانی پلەی دووەمی ڕیزبەندی وەرزی ١٩٨٢ — ١٩٨٣، لەگەل ڕێژەی گۆل تۆمارکردنی زۆر و ئاستێکی نایاب و لەبیرنەکراودا.

هەربۆیە جۆناسان وێلسن لایەنێکی تایبەتی تەرکیزی خستە سەر گراهام تایلۆر (١٩٤٤)ی ڕاهێنەری واتفۆرد، سەرکردەی واتفۆرد لەو دەمەدا، لەگەل شێوازی هێرشبردنیان، لە (٤ — ٤ — ٢)ەوە بۆ (٤ — ٢ — ٤)، بە سەرکەوتنی دوو یاریزانی بالەکان بۆ پێشەوە، پاشان (٣ — ٤ — ٣) بە سەرکەوتنی یەك تاك بۆ ناوچەی ناوەڕاست، گۆڕینی یاریزانێك لە ناوەڕاستەوە بۆ پێشەوە لە ڕواق، ئەوە دڕترین تۆپی پێی هێرشبردنە لە خولی ئینگلیزیدا.

تیپی واتفۆرد، بە سەرکەوتنی هەردوو تاکەکە بۆ پێشەوە، لەگەل هێشتنەوەی هێرشبەرەکان لە نزیك ناوچەی سزادا، لەگەل پێشڕەوی هێرشبردندا، نەیارەکەی ناچاردەکرد بە ئەنجامدانی دواکەوتنی بەرگری زیاتر بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم تەکتیکە، بەلام

کەمێك گۆڕانکاریدا، ئۆڵسن هەستا بە ڕێکخستنی پلانەکە بۆ (٤ – ٤ – ١ – ١)، بە ئامادەبوونی هێرشبەرێکی تەواو و لە دواوەیدا یاریزانێکی جوڵاو لە نێوان هێڵی ناوەڕاست و هێڵی هێرشبردندا. تیپێك هێرش زۆر نابات بەڵام دەزانێت چۆن هەلەکان بقۆزێتەوە، یەکسان بوونی بەرامبەر ئینگلتەرا لە وێمبلی بەدەست هێنا، لە کۆتاییدا بە یاوەری هۆڵەندا بۆ مۆندیالی ١٩٩٤ سەرکەوت.




پاڵاوتنی جامی جیهانی ١٩٩٤: ئینگلتەرا ١ – ١ نەرویج، ١٤ / ١٠ / ١٩٩٢

## حەڤدەیەم: سوارچاکێکی بێ سوار هاوکێشەکانی تۆپی پێی هەڵگەڕاندەوە

لەگەڵ هەر سەردەمێکی تۆپی پێدا، پێشینەکان ئاوادەبن و نەوەی نوێ دەردەکەون، تەنها چەند ناوێکی کەم نەبێت کە لای هەموان ڕێزیان لێ دەگرن و ناویان بە بەرزی دەمێنێتەوە، دیراسەی شێوازی تایبەتی یاریکردنیان دەکەن. لە نێوان ئەوانەدا کەچەڵە ئیتاڵیەکە دەبینرێت، کە سەرەتای ژیانی بە پێڵاو فرۆشتن دەستی پێکرد، پێش ئەوەی پیشەگەرێتی کاری ڕاهێنەرایەتی ئەنجام بدات و سەرپەرشتی دروست کردنی یەکێك لە گەورەترین نەوەکانی تۆپی پێ بکات، ئەویش میلانی هەشتاکان و سەرەتای نەوەدەکانە.

**بۆچی؟**

"مارکۆ ڤان باستن" هەمیشە پرسیاری لێ دەکردم: "بۆچی پێویستە هەموو یاریەکان ببەینەوە لەگەڵ پێشکەش کردنی ئاستێکی ڕازیکەر و نایاب؟ چەند ساڵێك لەمەوبەر گۆڤاری فرانس فوتبۆڵ ڕاپۆرتێکی لەسەر گەورەترین ١٠ تیپی مێژوو نووسی بوو، تیپەکەی من پلەی چوارەمی بەدەست هێنا، لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی خاوەن پلە یەکەمەکانی پێشەوە هەڵبژاردە بوون، هەنگاریای ١٩٥٤، بەرازیلی ١٩٧٠، هۆڵەندای ١٩٧٤. هەربۆیە وێنەیەکم لەو گۆڤارە بەدەست هێنا و بردم بۆ ڤان باستن، چەند ووشەیەکی خێرام پێ

گووت: "لەبەرئەم هۆیە تەنها و هەمیشە گەیشتن بە کاملبوون و ترۆپکی تۆپی پێم لێتان دەویست". ئەریگۆ ساکی (١٩٤٦) بە شانازیەوە باسی تیپە مێژووییەکەی دەکات.

"ئەمەم لەپێناو نووسینەوەی مێژوودا ئەنجام نەدەدا، بەڵکوو لەبەرئەوەبوو دەم ویست نەوەد خولەك چێژ و خۆشی بە خەڵك پێشکەش بکەین، دەمویست بیسەلمێنین خۆشحاڵی تەنها لە رێی بردنەوەوە بەدەست نایەت، بەڵکوو لە رێگەی چۆنێتی بەدەست هێنانییەوە دەبێت. بەڕاستی ئەمەم لە پێناوی دڵسۆزی ئەنجام دا، نەك لەبەرئەوەی بمەوێ لەگەڵ میلان خولی ئیتاڵی و چامپیۆنس لیگ بەدەست بهێنین. من تەنها پیاوێکم کۆمەڵێك بیرۆکەم هەڵگرتووە، حەزدەکەم بە شێوازی تایبەتی خۆم پێشکەشی بکەم، ڕاستە کە لە سەرەتادا باو نەبوو، بەڵام لە کۆتاییدا ڕێگای خۆی دۆزیەوە".

**ئایا تەنها بردنەوە باس دەکرێت؟**

خۆرخی ڤالدانۆ باس لە فەلسەفەی تۆپی پێ دەکات و دەڵێت :

"زۆربەی خەڵك بڕوای وایە تەنها ئەنجام گرنگە و پاش تێپەڕبوونی دەیان ساڵ تەنها باسی بردنەوە دەکرێت، بەڵام ئەمە ڕاست نییە، ئێمە باسی میلانی ساکی زیاتر دەکەین تاکو میلانی کاپێلۆ، سەرەڕای ئەوەی تیپەکەی کاپێلۆ پاڵەوانێتی گەورەتری بەدەست هێنا و پاش تیپەکەی پیاوە کەچەڵەکە هات. میلان بە تەنها نا، بەڵکو هەلبژاردەی هۆڵەندای حەفتاکان لە چاو هەڵبژاردەی ئەڵمانیای

ڕۆژئاوا پڕ جەماوەرترین بوو، سەرەڕای ئەوەی ئەڵمانیەکان خاوەنی مۆندیالی ١٩٧٤ بوون، پەند لە گەڕان بە دوای کامڵبووندایە، هەرچەندە دەزانین لە تۆپی پێدا بوونی نییە، بەڵام ئەمە ئەرکمانە لە بەرامبەر تۆپی پێ و تەواوی مرۆڤایەتیدا، ئا ئەمەیە دەبێت ئەنجامی بدەین، وە پاشان ئەنجامەکانیش بەدەست دێن".

ئەریگۆ ساکی دەڵێت : " لە توانامدا هەبوو ڕۆد گولێت لە ناوەڕاست دابنێم و ڤان باستن کەمێك بهێنمە دواوە، هەروەك چۆن زۆربەی یانەکانی کالچیۆ ئەنجامیان دەدا، لە بری هێرشبردن لە پێشەوە، تیپەکە بگەڕێنمە دواوە تاکو ناوچەی ناوەڕاست، بەڵام ئێمە ڕێگا ئاڵۆزەکەمان هەڵبژارد، بە هێڵێکی بەرگری پێشکەوتوو یاری بکەین، لە سێ یەکی کۆتاییدا هێرش ببەین، لە چەقەوە تێپەڕبین و لە لاکانەوە لێان بدەین، لەگەڵ ئەنجامدانی پاساتی کورت کە توانای کردنەوەی کۆدی بەرگریەکانی هەبێت، ئا لێرەدا بازدانە گەورەکە هات".




پێکهاتەی یاری گەڕانەوەی چوارگۆشەی زێڕینی چامپیۆنس لیگی وەرزی ١٩٨٨ – ١٩٨٩: ئەی سی میلان ٥ – ٠ ڕیاڵ مەدرید

## دژی تابوتەکان

فشار بە ڕۆیشتنی زۆر یان بە کاری ئاڵۆزی و جیدی نییە، بەڵکو بە دەست بەسەراگرتنی بۆشاییەکان و ناچارکردنی دژبەرەکەتە، کە بە شێوەیەك یاری بکات خۆی حەزی لێ نەکات، ئەگەر ڕکابەرەکەت جێهێشت بە ئازادیەکی تەواو یاری بکات، ئەوا ئەو بە بڕوا بەخۆبوونەوە یاری دەکات و لێت دەباتەوە، فشاری دروست زیاتر کردەیەکی دەروونییە تا جەستەیی، ستراتیژیەتێکی بەکۆمەڵە، دەبێت هەر ١١ یاریزانەکە لە دۆخێکی چالاك و کاریگەربن، بتوانن لە هەموو کاتێکدا بەرهەڵستکاری ڕکابەر ببنەوە.

ئەریگۆ ساکی سەرجەم تابوتەکانی سەردەمی خۆی تێك شکاند، نە یاری کردن بە لیبرۆ و نە یاری کردن بە بەرگریەکی پەتی، بە شێوازی (٤ – ٤ – ٢) دەستی پێ کرد، بەڵام لەگەڵ فشارێکی نائاسایی و نەجاعەی هێرش بردنێکی کاریگەر "Pressing Game". لە کاتی هێرشبردندا هەڵگری تۆپەکە دەبینێت پێنج یاریزان لە گەڵین بۆ یارمەتیدانی لەگەڵ دوو تاکەکەی تەنیشتیەوە، تیپەکە هێرش دەبات و بەرگری دەکات وەك یەك کوتلەی یەکگرتوو. فەلسفەی ساکی پشتی دەبەست بە زەرورەتی تێگەیشتنی یاریزان سەبارەت بە تەکتیك و سیستمی تیپەکە بە تەواوەتی نەك تەنها شوێنەکەی خۆی.

هەرەمی هەڵگەڕاوە




پێکهاتەی فینالّی چامپیۆنس لیگی وەرزی ١٩٩٣ – ١٩٩٤: ئەی سی میلان ٤ – ٠ بەرشەلۆنە

هەربۆیە داوای دەکرد لە تیپەکانی تازەپێگەیشتووانی پێویستە یاریزانی بچووك فێری لایەنی هونەری و تەکتیکی و هەموو لایەنەکانی تری تۆپی پێ بکەن. شێوازێك بە تەواوەتی پشتی کلاسیکیەتی ئینگلیزی شکاند، کە پشت دەبەستێت بە تایبەتمەندی زۆر لە پلاندا، هەر یاریزانێك تەنها ئەرکی شوێنەکەی خۆی فێردەکرێت و هیچ باکی لە شوێنێکی تر نییە. جیاوازی میلان بلە توانایی یاریزانەکانیەتی لە گونجاندن لەگەڵ هەر گۆڕانکاریەك لە نێو یاریگەدا، گونجانی

تــەکتیکی وادەکــات لــە بــەرگریکارێکی وەك "رایکــارد" کــە وەك یاریزانێکی ناوەند بدرەوشێتەوە، یاریزانێکی ناوەندی وەك "گۆلێـت" لە هێرشبردن خۆی ببینێتەوە.

لەبەر ئەم هۆیانە، ئەریگۆ سـاکی شایـستەی پیاهەڵدانی تـەواو بــوو لــە لایــەن پــسپۆرانی بــواری تــەکتیك، لەبەرئــەوەی نــاوبراو یارمەتیـدەربوو لـە پێشخستنی هونـەرەکانی تـۆپی پـێ، بـەدوور لـە ئەگەرەکانب بردنـەوە و دۆڕاندنـدا، هەربۆیـە هـەرەمی هەڵگـەڕاوە لـە بەردەمیدا زۆر وەستایەوە.

## هەژدەیەم: باشترین پاڵەوانێتی لە هەزارەی نوێدا ... ڕۆمانی کلاسیکی ... هەڵبژاردەی فیرعەونەکان!

یاریزانی باڵی کلاسیکی لەگەڵ ئالف ڕامسی و ڤیکتۆر ماسلۆڤ کۆتایی پێهات، پاشان ئەو ئەستێرانەی لەسەر هێڵ جیاوازی دروست دەکەن کە دەناسرێت بە (فانتازیستا) دەرکەوتن، تاکو بڵاوبوونەوەی شێوازی یاریکردنی (٣ – ٥ – ٢) و داتاشراوەکانی لە یاریگەکانی ئەورووپا و جیهاندا، بۆ دەرکەوتنی ئەریگۆ ساکی، ئەو ڕاهێنەرەی توخمی جوانی بۆ سیستەمی هێڵەکی زیادکرد، لەگەڵ ڕێکوپێکی تەواو و زاڵبوونی ژمارەکان لە کییەف، کەلەوێدا ڤالێری لۆبانۆڤسکی ئامادەیی دەبێت. تۆپی پێی واقعی دووبارە پێشەنگی گرتەوە دەست لەگەڵ میلانی کاپێلۆ، پاشان بەرازیلی ١٩٩٤، ئەو هەڵبژاردەیەی بوو بە پاڵەوانی جامی جیهانی لەگەڵ دووانەی تەوەر کە هەرگیز هێرش نابەن، ئەوانیش: دۆنگا و ماورۆ سیلڤان، یاریەکە بە گوێرەی سیستمێکی دیاریکراو بۆ چەند ساڵێك دەڕۆیشت، لەگەڵ هەندێك تابلۆ و بازدانی جیاکەرەوە.

## یۆرۆی ۲۰۰۰

پاڵەوانێتی نەتەوەکانی ئەورووپای ۲۰۰۰ جوانترینە لە تۆپی پێی تازەدا، ئینگلتەرا لەگەڵ (ماکمانەمان، سکۆلز، بێکهام) لە ناوەڕاستدا، ئیتاڵیا و پلانی (۳ – ٤ – ۱ – ۲) کە پێی گەیشتە یاری کۆتایی، فەرەنسای پاڵەوان بە سەرکردایەتی زەیدان و هێنری هێرشبەر. لەگەڵ دەرکەوتنی لەبیرنەکراوی (هۆڵەندا و پرتوگال)، هەڵبژاردەی هۆڵەندا کە بە دینامیکیەتی ڕوون جیادەکرایەوە، (بێرکامپ، زیندین، ئۆڤەرمارس) لە دواوەی کلایڤەرتی هێرشبەری تەواو، لە لایەکی دیکەوە بەرازیلی ئەورووپا لەگەڵ (فیگۆ، کۆستا، پینتۆ)و نۆنۆ گۆمێزی هێرشبەر، ڕیگای درەوشانەوەیان دۆزیەوە.

تۆپی پێ لەو ماوەیەدا بە یاریساز لەسەر شێوازی کلاسیکی دەناسرا، وەك: (ڕۆی کۆستا، زەیدان، لیۆناردۆ، بێرکامپ و ... هتد)، هەروەها لەگەڵ بوونی کۆپیەکی دیاری کراوی یاریزانی ئێرتیکازدا، یاریزانی ناوەڕاستی بەرگریکار هەبوون، کە توانای بڕینی تۆپیان هەیە و خاوەنی کۆششی بەرگریکردنی زۆرن، وەك: (ئامبرۆزینی، ئەلبەرتینی، تۆماسی، داڤێدز، دیشامپ، دی لیڤیۆ) ناوەندی بەرگریکاری تەواو لە بۆ دابینکردنی کەشێکی لەبار بۆ یاریسازەکان لە سێ یەکی کۆتایی هێرشبردندا.

شێوازەکانی یاری کردنی (۳ – ٤ – ۱ – ۲) و (٤ – ٤ – ۲)

بەشـــێوەیەکی نائاســـایی بڵاوبوویـــەوە، دووانـــەی هێرشـــبردنی پێشکەوتوو، لە دواوەیان یاریزانێك دیاریـان پێـشکەش دەکـات، گۆڵ دروست دەکات و تۆماریشی دەکات، لەگەڵ داپۆشینی گشتگیرانە لـە لایـەن یاریزانـانی ناوەڕاسـتدا. تـۆپی پـێ پـشت دەبەسـتێت لەسـەر پسپۆڕی لە هەموو شتێکدا، یاریزانێـك بـەرگری دەکـات و ئـەوەی تـر هێرش دەبات، ئا بەم شێوەیە بوو شێوازی یاریکردن لە سـەرەتاکانی هەزارەی نوێدا.




پێکهاتەی فینالی یۆرۆی ٢٠٠٠: فەرەنسا ٢ – ١ ئیتاڵیا، یاریگـەی دی کۆیـپ، ڕۆتەردام

## خوان ڕۆمان ڕیکێلمی

پاش وازهێنانی مارەدۆنا لە تۆپی پێدا، چەندین ناوی نوێ لە ئەرژەنتین دەرکەوتن، (ئۆرتێگا، ئایمار، دالیساندرۆ، سافیۆلا، ریکێلمی و لە کۆتاییدا میسی). لێو خۆی خستە خانەیەکی جیاواز، بەڵام نەك لەبەرئەوەی تەنها یاریسازە، تەنانەت لە سەرەتادا لەگەڵ بەرشەلۆنە لە باڵ یاری دەکرد، وەك یاریزانێکی لای تەواو، میسی لە دەرەوەی ڕیزبەندیە لاتینیەکانە، بەڵام "تێڤێز" بە نیو هێرشبەر و بە نیو یاریساز دادەنرێت، یاریزانێکی نزیك لە ژمارە نۆ و نیو.

ریکێلمی جیاوازە، کاتێ ئیدواردۆ گالیانۆ (١٩٤٠ – ٢٠١٥) بەراوردێکی کرد لە نێوان یاریزانانی ئەرژەنتینیدا، ڕیکێلمی لە سەرووی هەموان دانا و گوتی: "خوان خاوەنی پێدانێکی جیاوازە و شێوازی یاریکردنی زۆر سەربەستە". گالیانۆ، ڕیکێلمی دەکات بە کۆتا یاریساز لەسەر شێوازی کۆن و دەڵێ: "ئەو یاریزانێکی ڕۆژگارە کۆنەکانە، ئەو کاتانەی ژیان سادەتربوو، هاندەران کورسیان لە ماڵەکانیان دەبرد لەبۆ بینینی تۆپی پێ لە جادە و گەڕەکەکاندا".

ڕەنگە خێراییە کەمەکەی وای لێ کردبێت بەو شێوەیە یاری بکات، لە هەموو حاڵەتەکاندا ریکێلمی کۆدی هەر ئایدۆلۆژیایەکی تۆپی پێ دەکاتەوە، لەبەرئەوەی ئەو نموونەی مشتومڕی تیۆری نییە، بەڵکو بەهرەدارێکی زۆر دەگمەنە و لە کاتێکدا لەدایك بووە

پێویستی بە بەرگریکردنی جیاواز هەیە، هەربۆیە دیارترین خاڵە لاوازەکانی نیشانەکانی ئەم سەردەمەیە، گرنگترین خاڵە بەهێزەکانی لە هیچ یاریزانێکی ئەم سەردەمەی جگە لەم بوونی نییە !

ئەوەی دەمێنێتەوە، گۆڕانکاریە نامۆکەی پیکەرمانە (١٩٤٩) لە قۆناغی هەشتی مۆندیالی ٢٠٠٦، کاتێك ڕیکێلمی هێنا دەرەوە و لە بری بەشداری پێکردنی یاریزانێکی هێرشبەر، گۆڕی بە کامبیاسۆی بەرگری، یاریەکە یەکسەر هەڵگەڕایەوە، ئەڵمانەکان ئەنجامەکەیان یەکسان کردەوە، پاشان بە لێدانی یەکلاکەرەوە بردیانەوە.

### هەڵبژاردەی فیرعەونەکان

پاش مۆندیالی ٢٠٠٦، ئەو یانە و هەڵبژاردانەی بە شێوازی (٣ — ٥ — ٢) یاریان دەکرد کەمی کرد، هەتاکو کرواتیاش دەستی هەڵگرت لەو شێوازی یاریکردنە بەهۆی بوونی یاریسازێکی هاوشێوەی لۆکا مۆدریچ. هەڵبژاردەی میسر لەو کەمینانە بوون کە پارێزگاریان لەو بەڵێنە کرد، پاڵەوانێتیەکانی ئەفەریقیای ٢٠٠٦ و ٢٠٠٨یان بەدەست هێنا، بە شێوازی یاری کردنی (٣ — ٤ — ١ — ٢) لەگەڵ ڕاهێنەر حەسەن شەحاتە (١٩٤٧)، فیرعەونەکانی میسر سەرکەوتووبوون لە شکست پێهێنانی بەهێزترین هەڵبژاردەکانی خۆرئاوا و ناوەڕاستی ئەفەریقیادا، کە زۆربەی یاریزانەکانیان پیشەگەربوون لە یاریگەکانی ئەوروپادا.

زۆربەی تیپەکانی ئەفەریقیا لەو کاتەدا زیاد لە هێرشبەرێکی

ناوازەیان هەبوو، هەربۆیە بە پلانی نزیك لە (٤ – ٤ – ٢) یاریان دەکرد، بە بوونی دوو هێرشبەری تەواو لە پێشەوەدا، لەگەڵ ناوەڕاستێکی بەرەولای چەق، هەربۆیە ئەم پلانە زۆر لەگەڵ بیرۆکەی میسریەکان دەگونجا، شەحاتە بەرەوڕووی هێرشبەرانی ڕکابەراکانیان بوویەوە بە هۆی هەبوونی دوو بەرگریکاری تەواو، لەگەڵ یاریزانی سێ یەم بۆ دوورخستنەوەی تۆپ، بەڵام یاریزانی لاکان خۆیان بەبێ هیچ چاودێری کردنێك دەبینیەوە، بەهۆی ئارەزووی ئەفەریقیەکان لە تێپەڕبوونیان لە چەقەوە.

لە یاری کۆتایی جامی نەتەوەکانی ئەفەریقیای ٢٠٠٨ لە بەرامبەر کامیرۆندا، ڕاهێنەری شێرەکان هەستا بە دەستکاری کردنی پلانەکە بۆ (٤ – ٢ – ٣ – ١) لەگەڵ ئیتۆ وەك تاکە هێرشبەر، وائیل جومعە وەك یاریزانێکی بێ پیشەی خۆی دەبینیەوە، لە کاتی چاودێری کردنی ساموێل، شادی محمدی هاوڕێی بێ هیچ ڕۆڵێك دەبێت، ئەم یاریە گرانترین یاری بوو بۆ فیرعەونەکان، تاکو ڕووبەڕووبوونەوەی سۆنگ و زەیدان، و گۆڵە مێژوویەکەی ئەبو تریکە کە پاڵەوانێتیەکی نوێ و گرنگی بۆ میسریەکان دەستەبەرکرد.

هەرەمی هەڵگەڕاوە




پێکهاتەی فینالّی جامی نەتەوەکانی ئەوروپای ٢٠٠٨: میسر ١ — ٠ کامیرۆن، یاریگەی ئۆهین دجان، ئەکرا، ١٠ / ٢/ ٢٠٠٨

هــەرەمی هەڵگــەڕاوە دووبــارە لــە نێــو گــژوگیاکانی کیــشوەری ڕەش گەڕایەوە، بەڵام جیهانی تۆپی پێ هەرگیز لە گۆڕانکـاری کـردن ناوەســتێت، پلانــی (٤ — ٢ — ٣ — ١) بــاڵی کێــشا بەســەر کــەش و هەواکاندا بەشێوەی نیوە تەواو، جۆناسۆن وێڵسۆن تێبینی تــەکتیکی گرنگ لە لاپەڕەکانی کۆتایی کتێبەکەی دادەنێت، پــێش ئــەوەی ئــەم سوپرایزە خۆشە بتەقێنێتەوە، بە توانای کارکردن لە بەرگی دووەمی کتێبەکەیدا.

## کۆتایی : سەرکەوتنی پاسدان ... واژوو: بەرشەی گواردیۆلا

## ... چیرۆکەکە بەردەوامە!

نووسەری کتێبی" هەرەمی هەڵگەڕاوە" بریاریداوە کە لە ڕوانگەیەکی دیکەوە لە تۆپی پێ بڕوانێ، لەو ڕوانگەوە ئەو کەسانە بناسێنێ کە بەشداربون لە بونیادنانی تیۆری تێگەیشتنی تۆپی پێ و هەوڵیانداوە ئاراستەی جیاواز بگرنە بەر لە ڕەوتەکانی دیکەی شیکاری. تۆپی پێ وەك ژیان وایە، تێگەیشتن لێی بە شێوازی نمونەیی هەنگاوێکە بۆ چێژ وەرگرتن لێی بە شێوەیەکی باشتر، لەبەرئەوە نوسەر لەم ئاراستە گرنگەوە هەنگاوی ناوە، پوختەیەکی تەکتیکی تەواوی داناوە لەسەر مێژووی پێشکەوتنی یاری تۆپی پێ، لەگەڵ ئەوەشدا لە چەندین چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەوانیدا جەختی لەسەر ئەوە کردوەتەوە کە سوورە لەسەر نوسینی بەشی دووەمی ئەم کتێبە بەناوبانگەی.

### (٤ – ٢ – ٣ – ١)

شێوازی یاریکردنی (٤ – ٢ – ٣ – ١) لە ئیسپانیا بڵاوبوویەوە، لەگەڵ گەڕانەوەی جۆ تۆشاك (١٩٤٩) بۆ ڕاهێنەرایەتی ڕیاڵ مەدرید، "جێریمی" و "ریدۆندۆ" لە ئێرتیکاز لە بەردەمیاندا "ماکمانەمان" و "ڕائول" و "بالیچ"، لەگەڵ "ئەنێلکا" یان "مۆریانتس" لە ساڵی ١٩٩٩. هەروەها خافیێر ئیرۆریتا (١٩٤٨) لەگەڵ

دیپۆرتیڤۆ لاکەرۆنیا، پاکانەی داهێنانی ئیسپانی ئەم شێوازە لە سەرەتای نەوەدەکاندا بۆ خوانما لیۆ (١٩٦٥) دەگەڕێتەوە، کاتێ لەگەڵ تیپی لیۆنیسا بە دووانەی تەوەر یاری دەکرد، سامی و ئەباگۆ، ئەم پلانە بە بڵاوبوونەوەی بەرزی جوان و داخستنی زۆربەی بۆشاییەکان لە نێوان هێڵەکاندا، دەناسرایەوە.




لەم پلانەوە (٤ – ٢ – ٣ – ١) بۆ پلانی داری جێژنی سەری ساڵ (٤ – ٣ – ٢ – ١) لەگەڵ میلان لە ساڵی ٢٠٠٧، دوای ئەوەی

کارلۆ ئەنیچلۆتی (١٩٥٩) سودی لە یاریزانانی هێڵی ناوەند وەرگرت، و یاسـایەکی تـەکتیکی تۆکمـەی لـەم هێڵـەدا دانـا. گـاتۆزۆ وەك یاریزانێکی تۆپ بڕ، لە نزیك پێرلۆی ریجیستا لەگەڵ پاڵپشتی تـەواو لە لایـەن ئـامبرۆزینی یـەوە، سیانەیەك لـە دواوەی کاکـا و سیدۆرف یاری دەکەن، لە بەردەمیاندا پیپۆ ئینزاگی دەبینرێت.




لـە لایـەکی دیکـەوە جـۆزێ مۆرینیـۆ (١٩٦٣)، لـە ویلایـەتی یەکەمی لە چێڵسی بە شێوازێکی هاوسەنگ یاری دەکرد، مەکالیلی لە ئێرتیکازی بەرگری، ئیـسیان و لامپـارد لـە بەردەمیـدا، لەگـەڵ داف و ڕۆبـن لـە لاکانـدا، دیدیـە درۆگبـای ئیڤـواری وەك هێرشـبەری تـەواو، شـێوازێك ئاوێتـەی نێـوان (٤ – ١ – ٢ – ٣) و (٤ – ٥ – ١)، لــە

کۆتاییدا هەمووی لە (٤ – ٣ – ٣) دەردەچێت.




**دەرەوەی پۆلێنکردن**

وێڵسن بە قسەکردن لەسەر ڕۆما و مانچستەر یونایتد کۆتایی دەهێنێت بە هەرەمی هەڵگەڕاوە، یانە ئیتاڵیەکە لەگەڵ لوجیانۆ سپالێتی (١٩٥٩) ڕاهێنەر بەبێ هێرشبەری ڕاستەقینەیی بوو، تۆتی زۆر دەگەڕێتەوە بۆ دواوە، دەبێت بە هێرشبەری وەهمی و یاریسازێك لەبەردەم پیزارۆی ئێرتیکازدا، لەگەڵ پاڵپشتی لە لایەن دووانەی ناوەند پیرۆتا و دی ڕۆسی لە چەق، لەگەڵ تادێی و مانسینی لە لاکاندا. پلانی (٤ – ١ – ٤ – ١) کە دەگۆڕدرێت بۆ پلانی (٤ – ٦– ٠)، بەبێ ژمارە نۆی ڕاستەقینە.

**هەرەمی هەڵگەڕاوە**




لە لایەکی ترەوە مانچێستەر یونایتد لەگەڵ سێر ئەلێکس فێرگسۆن (١٩٤١)، باشترین (٤ — ٤ — ٢) لە یاریگەکانی ئینگلتەرای جێبەجێکرد، بە بوونی گروپێکی بەکۆمەڵ توانای یاری کردنی لە زیاد لە یەك شوێنی نێو یاریگەدا هەیە، (رۆناڵدۆ، تێڤێز، گیگز، هارگریڤز، رۆنی) ناوانێك شکۆمەندیان لەگەڵ کەتیبەی شەیتانە سوورەکاندا دروست کرد، چامپیۆنس لیگی ی٢٠٠٨ بەدەست هێنا، فینالی ٢٠٠٩ بە بەرشەلۆنە دۆڕاند.

تێڤێز هێرشبەری دواکەوتوو لە شوێنی ١٠ لە یاریگەدا،

دەگەڕێتەوە بۆ دواوە بۆ ئەوەی پلانەکە ببێت بە (٤ – ٤ – ١ – ١). پاشان رۆناڵدۆ دەرواتە چەق لەنێو ناوچەی سزا بە تەنیشت رۆنی، پلانەکە دەگۆڕدرێت بۆ پلانی (٤ – ٣ – ١ – ٢)، لەگەڵ سەرکەوتنی ئاندرسۆن بۆ چەقی هێرش بردن لە پلانی (٤ – ٤ – ١ – ١)، ئاوێتەی چەند شێوازێکی تەکتیکی گۆڕدراو لە یەك قاڵبدا، نهێنیەکەش دەگەڕێتەوە بۆ وردەکارییانە هونەریی و نایابی فێرگسۆن و قوتابیەکانی.




## چیرۆکەکە کۆتایی نایەت!

چەندین پلانی تۆپی پێ لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر گۆڕدرا، ئەمە دواین وشەکانی هەرەمی هەڵگەڕاوە بوو، بەتایبەتی باسی ساکی

کرد، لەبەرئەوەی تیپی میلانی ئەریگۆ زۆر گۆڕانکاری کرد لە شێوازی تەکتیکی مەنهەجی لە نێو یاریەکەدا، بەڵام کۆتایی نەبوو، هێشتا پەراوێزێك هەیە بۆ باشتربوون، تۆپی پێ لە ساڵانی داهاتوودا بەردەوام دەبێت و زیاتر بەرەوپێشەوە دەچێت.

مادام مرۆڤایەتی بوونی هەیە، بەدڵنیاییەوە بەم نزیکانە شتی نوێ دەردەکەوێت، وەگەرنا، تۆپی پێ دەمرێت. زۆربوون ئەوانەی بانگەشەی کۆتایی مێژوویان دەکرد، بەڵام کەسیان ڕاست نەبوون. ئا بەم شێوەیە وێڵسن لە دێڕەکانی کۆتاییدا فەلسەفیانە دەدوێت، بوار جێدەهێڵێت لە بەرامبەر دەرکردنی بەرگی دووەمی کتێبەکەی بەم زووانە، بەتایبەتی سەرسامی زۆری و هۆگربوونی بە تیپی بەرشەی گواردیۆلا.

"سەرکەوتنی پاسدان"، بەم شێوەیە وێڵسن ناونیشانەکەی نووسی کاتێ ئاماژەی بە بەرشەلۆنەی پیپ کرد، لەگەڵ گەڕانەوەی سیانەی دواوە بە گەڕانەوەی بۆسکێتس بۆ دواوە لە نێوان دووانەی دڵی بەرگریدا، گۆڕانی بۆ پلانی (٣ – ٧ – ٠)ی هێرشبردن، لەگەڵ تەمەرکوزی نمونەیی و پاسدانی بلیمەتیانە لە پێوە بۆ پێ.

لەبەر ئەوە بەدەر لە گوێدان بە ئەنجامەکانی بردنەوە و دۆڕاندن، بەدەستهێنانی ناسناوە زۆرەکانی گواردیۆلا لەگەڵ بەرشەلۆنەدا، ئەوا ئەم نەوەیەی تۆپی پێ – کە ئەم یاسا تەکتیکیەیان گرتە بەر – کاریگەری زۆریان هەبوو لەسەر یاساکانی

یاری تۆپی پێ، لەبەر ئەوە نوسەری کتێبی هەرەمی هەڵگەڕاوە ئەمەی هەڵبژاردووە، بۆئەوەی ببێت بە بەردی بناغەی ئەوەی لە داهاتوودا ڕوودەدات.

**تێبینی:**

ناوی ئەم کتێبە (Inverting The Pyramid)ە و لە حەفدە بەش پێکهاتووە، بەڕێز ئەحمەد موختار دەقە ئینگلیزیەکەی خوێندەوە، پاشان پوختەکەی لە بیست ئەڵقەدا لە ماڵپەڕی (العربیة الجدید)دا بڵاوکردەوە، منیش ئەو پوختەیەی ئەحمەد موختارم وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، لەگەڵ نووسینی ساڵی لەدایك بوون و مردنی ڕاهێنەرەکان، هەروەها زیادکردنی ئەلبوومی وێنەکان، هەربۆیە دەتوانین بڵێین ئەم وەرگێڕانە پوختەی کتێبی (هەرەمی هەڵگەڕاوە)یە.

# ئەلبوومی وێنەکان



جیمی هۆگان: باوکی تۆپی پێی ئەورووپای ناوەڕاست، تەکتیکی لێدانی سەر فێری "ڕاف"ی یاریزانی دەکات.



دیمەنی تووڕەبوونی ڤیتۆریۆ پۆتزۆی ڕاهێنەری ئیتاڵیاله فیناڵی مۆندیالی ۱۹٤۰، کە هەڵبژاردەی ئیتاڵیا بە ئەنجامی ۲-۱ لە هەڵبژاردەی چیکۆسلافاکیا بردەوە و بۆ دووەم جاری لەسەریەك بوو بە پاڵەوانی مۆندیال.



هێربەرت چاپمانی ئینگلیزی، داهێنەری تەکتیکی (دەبلیو ئێم - WM )



بۆریس ئارکادیڤ، هێڵەکانی بیرۆکەکەی (الفوضى الخلاقة) بۆ یاریزانەکانی دیاری دەکات



ماتیاس سیندیلار، هێرشبەری بلیمەتی هەڵبژاردەی نەمسا



ساندرۆ کۆچیس گۆڵ لە گیل مێریکی گۆڵچی هەڵبژاردەی ئینگلتەرا تۆماردەکات، لەم یاریەدا هەنگاریەکان بە ئەنجامی ٦-٢ لە ئینگلیزیەکانیان بردەوە لە یاریگەی وێمبلی، ئەم یاریە بە یاری سەدە ئەژماردەکرێت.



ئالیسیدیس گیگیا گۆڵی براوەی ئۆرۆگوای لە بەرازیل تۆمارکرد، فینالی مۆندیالی ١٩٥٠.



ژول ریمێـی فەرەنـسی، جـامی جیهـانی ١٩٥٠ دەدات بـە ئۆبـدۆلیۆ ڤـالێرلای کاپتنی هەڵبژاردەی ئورۆگوای



ڤیکتۆر ماسلۆڤ باسی نوێترین ستراتیژی خۆی بـۆ یاریزانـانی یانـەی تۆرپیـدۆ مۆسکۆ دەکات

**ئـەو سـێ کەسـەی تـەکتیکیان هێنایـە بـەرازیل، لـە سـەرەوە: مـارتیم فرانسیسکۆ، لای ڕاست: فلەیتاس سۆلیچ، لای چەپ: جێنتڵ کاردۆسۆ**



**بێلا گۆتمانی هەنگاری، ساتی ڕاهێنەرایەتیکردنی یانەی بەنفیکای پورتوگالی**




ڤیسێنتی فیۆلا، ڕاهێنەری هەڵبژاردەی بەرازیل، ناسێنەری پلانی (٤-٢-٤)



گارینشای بەرازیلی، ئەو (باڵ – Winger )ەی کە لە پلانی (٤-٢-٤) درەوشایەوە



ستان کولیس ماستەرپلانێکی تەکتیکی تر بۆ یانەی وڵڤەرهامپتۆن واندێریرس دادەنێت



نیریۆ ڕۆکۆ، یەکێك لە پێشەنگەکانی پلانی کاتیناچۆ



**هێلێنیۆ هێرێرا، جادوگەرە گەورەکەی پلانی کاتیناچۆ**



دیمەنی بەرزبوونەوەی ڕۆنی سیمیسۆنی گۆڵچی یانەی سەڵتیك بۆ گرتنی تۆپێك لە فیناڵی چامپیۆنس لیگی ١٩٦٦–١٩٦٧



سیزار لویس مینۆتی ڕاهێنەر، پاڵەوانی مۆندیالی ١٩٧٨ لەگەڵ هەڵبژاردەی ئەرژەنتین



کارلۆس بیلاردۆی ڕاهێنەر، پاڵەوانی مۆندیالی ١٩٨٦ لەگەڵ هەڵبژاردەی ئەرژەنتین



دووان لە زاناکانی تۆپی پێی یەکێتی سۆڤیەت، لای ڕاستەوە: ڤالێری لۆبانۆڤسکی، لای چەپەوە: ئیدوارد مالۆفیڤ



ڕینۆس میچێڵزی ڕاهێنەری هەڵبژاردەی هۆڵەندا و یۆهان کرۆیفی یاریزانی لە مۆندیالی ١٩٧٤، هەردووکیان پێکەوە تۆپی پێی سەراپاگیریان بەرەوپێشەوە برد



لای چەپەوە: گراهام تایلۆری ڕاهێنەری واتفۆرد، ئەو پیاوەی تۆپی پێی ئینگلیزی ئاشناکرد بە Pressing Game ، لای ڕاستەوە: ئیلتۆن جۆنی سەرۆکی یانەی واتفۆرد



ئەریگۆ ساکی ڕوونکردنەوە دەداتە مارکۆ ڤان باستن




پیلێ بە لێدانی سەر گوڵی یەکەمی هەڵبژاردەی بەرازیلی لە دژی هەڵبـژاردەی ئیتاڵیا تۆمارکرد، لە فیناڵی مۆندیالی ١٩٧٠



ماریۆ زاگالۆی ڕاهێنەری هەڵبژاردەی بەرازیلی پاڵەوانی مۆندیلی ١٩٧٠



خوان ڕۆمان ڕیکێلمی، کۆتا یاریسازی کلاسیکی



لۆکا مۆدریچ، یەکەمین یاریسازی نوێ

- کتێبی هەرەمی هەڵگەڕاوە بە یەکێك لە گرنگترین ئەو کتێبانە دادەنرێت کە باسی مێژووی تەکتیکی تۆپی پێ دەکات. ئەم کتێبە بە زانیاریەوە باسی پلان و شێوازی یاریکردن دەکات لە سەرەتای دەرکەوتنیەوە تا ئەم سەردەمە،لە پلانە سەرەتاییەکانەوە بۆ دواین پێشکەوتنەکانی ئەم چەند ساڵە. نووسەری ئەم کتێبە (جۆناسان وێڵسن) بە شێوەیەکی جوان باس لە پێشکەوتنەکانی لایەنی تەکتیکی تۆپی پێ دەکات.

- نووسەر لەم کتێبەدا باسی گۆڕانکارییە جەوهەریەکانی یاسا و ڕێساکانی تۆپی پێ دەکات, لە سەرووی هەموویانەوە یاسای ئۆفساید و گۆڕانکارییەکانی, دیارترین ستراتیژیەتەکانی تۆپی پێ لەگەڵ باسکردنی شێوازەکانی یاریکردنی (کاتیناچۆ،سەراپاگیری -کرة الشاملة - پراگماتیکی ئینگلیزی) و بەدڵنیاییەوە گەشەکردنە تۆقێنەرەکەی ئەی سی میلانی (ئەریگۆ ساکی) بە سەرکردایەتی سیانەی ترسێنەری هۆڵەندی (رایکارد, گۆلێت, ڤان باستن) لە یاریگەکانی ئیتاڵیا و ئەوروپادا.

# INVERTING THE PYRMID

T. Kamaran Palani


خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا
سلێمانی سەرەتای شەقامی مەولەوی
فەرعی سەعید تەها کۆیی
٠٧٥٠١١٢٨٢٨٨ - ٠٧٧٠١٥٧٥٠٦٧
Ktebxanai chwarchra


٤٠٠٠ هەزار